لەسەر ئەرکی عەلی بۆسکانی لەچاپ دراوە

# بۆ

# لەهەقە کەوتنە تەقە...؟

رەؤوف محمد زُهدی

پێشەکی یەکەی بەپێنوسی عەلی بۆسکانی یە

لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتیو لاپەڕەیەکی سپی

# بۆ

# لەهەقە کەوتنەقەقە...؟

ڕەئووف محمد زهدی

پێشەکی‌یەکەی بەپێنوسی عەلی بۆسکانی‌یە

---

چاپخانەی الحوادث..

بەغدا ـ ١٩٨٥

## پێشکەش

بەوانە بێت : کەلەپێنـــاوی راستیدا چـــەوتی گەمارۆیان دەدات‌و هەرگیز کۆڵ نادەن‌و بۆ پێشەوە دەچن •

# پێشەکی

نوسینی : علی بۆسکانی

دەمێك بو لەبارەی ( هەقە ) کسانەوە ، گەلێك شتمان بەگوێدا ئەدرا ... ئەوی ئەمانبیست هەر دەنگیهەبو ، ڕەنگینەبو ! بۆیە جێی گومانو لێکۆڵینەوەیە ، سەرەڕای ئەمەشس سەرچاوەکەی بەخشکەیو لەپەناوە ، ئەو بێگانانەبون کەوا لەم خاکەدا ، ڕاستەوخۆ بەرژەوەندیەکیان هەبو .. وە یائەو قسانە درۆودەلەسەو ، بوختانێکی ڕووت بون ، کەلەگەڵ ئاواتی ڕەسمی ئەو بێگانانەدا یەکیان ئەگرتەوە ، ویەك جەمسەریان هەبو ..، خۆ بەکری گیراوەکانیشیان ، هەر بۆ ( ئافەرین ) !، وەیا بۆ ( لێسمەوچڵپەیدەم !! ) یەكو دەیسان پێوە ئەنا .. وەك بروسکە درۆکانیان بڵاو ئەکردەوە .. ، دیارە درۆو بوختانیش هەرگیز لەگەڵ هیچ پەیڕەوێکی ، نەئەرزی ..، نەئاسمانیا ڕێك ناکەوێتو دانویان پێکەوە ناکوڵێت .. !

لەناو خوێشمانا ، ئەوانەی پیشەیان لێدوانە ! وەیان نوسینو لێدوانیان کردوە بەپیشەو ، هونەرمەندن تیایا ، زۆر کەم ڕاستەوخۆ ئەچن بەلای

کێشەیەکی کۆمەڵگەدا ••، بە دەگمەن لێکۆڵینەوەو شیتەڵکردنەوەیەکی ( مەیدانیان ) دەربارەی هیچ چەندو چونێکی کۆمەڵایەتی پێشکەش کردوە ! خۆ ئەگەر لەم بارەیەوە شتێکیشن هەبوبێت ، هەر پشت بەو بێگانانە بەستراوە ، نوسینەکانی ئەمان کراون بەسەرچاوەی لێدوان و باسەکە ، بۆیە تاسوقمان لێی نەشکاوە ، بەجۆرێك کە بڵێین : ( ئۆخەی ئەوە ئێمەین بەنینۆکی خۆمان ، سەری خۆمان ئەخورێنین ••! )

ئەگەر نەڵێم هەمیشە ، بەڵکو گەلێك جار ئەو بێگانانە لەپێشکەش کردن و چارەسەرکردنی کێشەکانمانا ، مەلۆتکەیەکی گۆج و تێك شکاویان پێشکەش کردوین ، هەربەم جۆرەش بە خەڵکی تریان ناساندوین ، وەڕاگەیاندوین • !! گەرچی کەمتەرخەمیش لەم ڕووەو ، لەلایەن خۆمانەوە ، بەهانەو بیانوەکەی عەقڵ ئەی گرێ ••!

ئەو بێگانانەی کەلە وڵاتی ترەوە هاتبون ، ولەسەریان نوسیوین و گوایا پێمانەوە خەریك بون و ئێمەیان خۆش ئەوێ ••• هتد ! کوردواتەنی : ( خۆشەویستیان نەمرێ ، وسکیان بەچێشتی گەرم نەسوتێ ••!! ) دەبا منیش بەتەوسەوە بڵێم : (دەمیان بە ئاگری نەوتەکە نەسوتێ • ! ) ئەگەر هەرچیەکیان لەسەرنوسیبین ، هەر بۆخزمەتی ئەو مەبەسە بوە کەلە پێناویا هاتبونە خزمەتمان••و خزمەت لەئێمەوە ••! ئیتر بەهەر بارێکا قەڵەمیان لەکاغەز دابێت بۆمان ، هەرگیز مەبەسە ، سەرەکیەکەی خۆیانیان لەبیر نەچۆتەوە ••، ئەگەر نەڵێم ئەو مەبەسەیان ( هەوێنی ) هەمو بیرکردنەوەو گشت کردەوەیەکیان بوە •• !

( هەقە )کان بەرەیەکن لەوانەی کە هەندێ لەبێگانەکان ، بێ ویژدانانە لەسەریان نوسیون •• چونکە سەریان بۆ دانەنەوانبون ، وەنەبوبونە بەکرێ گیراویان ، وەیا بەکرێ نەئەگیران ••! ئەم

ئوسینانەشیان لەکاتێکدا بوە نەك بۆگەشتوپشکنین هاتبون ، بەڵکو قوناغی گەشتوپشکنین تەواو بوبو ، ئنجا ئەیانویست نەخشە بۆبناغەی بەڕێوەبردنێك بکێشن ، کەوا قەڵفان بێت بۆ دەسەلاتی نەهێنی ئەوساو پاشەڕۆژیان . لەڕێڕەوی حوکومڕانیو حوکوم فەرمایاندا .. ! بۆیە بەرپەر چدانەوەیان بە ( وەستایی )و بەشێوەیەکی علمی ، ئەرکێکی گرنگو پیرۆزی سەرشانی هەمو ڕۆشنبیرێکی کوردە ، کە ڕێزی ڕۆشنبیریەکەی بگرێت ، وخۆی بەلێپرسراو بزانێت بەرامبەر بەناسینو زانینو زانیاریو ڕۆشنبیری .. هتد ئەڵێم بە ( وەستایی ) چونکە دڵنیام لەوەی کەئەو بێگانە داگیرکەرانە ، لەکاروباری خۆیاندا ، تەواو ، وەستاو ، شارەزان ... هتد ئیتر بەپێی ئەم شارەزاییەی خۆیان ، کەلەناخی بەرژەوەندیانەوە هەڵئەقوڵێت ، ویستویانە نەخشە بۆ هەمو چالاکیەکی کۆمەلایەتی ، وبیرکردنەوەیەکان بکێشن ..!

دیارە بەرپەچدانەوەش ، خۆپاراستن و « بەرگری لەخۆ » کردنی تیایە .. کە ئەمەش مافێکی ڕەواو بەجێیە..، سەبارەت بەم مافە ـ مافی بەرگری لە خۆکردن ـ مامۆستای پارێزەر (مصطفی عسکری) کەلەشێخانی ( هەقە )یە ، بە هاریکاری مامۆستایان ( محمدی ملا کریم ، وحمزە عبداللە ، و د . عزالدین مصطفی رسوڵ )...و چەند کەسێکی تر کەخۆی ناوی هێناون ، کتێبێکی بەناوی ! ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە )چاپکردو بلاوکردەوە . کتێبەکەی ئەو ، لەڕاستیدا بەشداریە کەلەمشتوماڵ کردنی کارەساتو ڕووداوێکدا کە بەسەر بەرەی (هەقە)دا هاتبو ، کەوا دەموودوی بێگانە تارماییو پەردەیەکی ڕەشی لای خەڵکی بەسەر ڕەوشتو کردەوەیانا هێنابو ! بەجۆرێك لایەنە ڕوونەکو دوەوشاوەکەشی تاریكو لێڵ کردبو ، ئەمە سەرەڕای تەکاندنی تەپوتۆزێك ، کەوا بەدرێژایی ئەم ماوەیەی دوایی ، لەبزوتنەوەکە

نیشتبو •• !

لەڕاستیدا مامۆستا ( مصطفی عسکری ) ، سەردەقی بۆ نوسەرو ، ڕوشنبیران شکان •• تا ڕادەیەکیش ، سەرنجی ڕاکێشان بەلای بەسەرهاتی بەرەیەکا ، کەوا لەسەر خاك‌وئاوێك لەگەڵیانا پێکەوە ئەژین‌و سپڵەییە
بەرەیەکا ، کەوا لەسەر خاك‌وئاوێك لەگەڵیانا پێکەوە ئەژین‌و سپڵەییە
ئەگەر نەی‌سەلمێنین بە درێژایی مێژووی ئەم بەرەیە ، خانەوخانەقایان ، ماڵ‌و مەڵبەندیان ساوپەناو ( داڵدە )ی لێ‌قەوماو ، و لێ‌قەوماوان بوە لە دەست دەستدرێژی‌و چەرخی چەپگەردو جەوروستەم •••!! وەلەڕێبازی پشت‌شکان‌و ناوزڕاندنیشیانا ، بێگانەو نۆکەرەکان و نان‌خۆرەکانیان ، لەم کارە ناهەموارانەدا بەرامبەر بە( هەقە )کان دەستێکی بالایان هەبوە••!! خۆ قسەنەستەقەکەی لەمەرپێشینانی خۆیشمان ئەڵێ : ( جام وتویەتی ، بشکێم‌و نەزڕێم ••! )چونکە لەڕووی کۆمەلایەتیەوە دەنگ دانەوە ( زڕاندن )لە شکان گورجك برتره ••!

بەڵێ : مامۆستا ( مصطفی عسکری ) ڕچەی‌بەستەڵەکی نوسینی لەسەر ( هەقە )کان شکان •• چەند کەسێکی‌تریش وەکو مامۆستای پارێزەر ( جمال بابان ) ، ومامۆستا ( رشید محمد علی ) بە دوایا هاتن•• تا گەیشتە سەرمامۆستا ( شیخ رؤوف زوهدی )ئەمیش نەی‌ویست لەکاروان دواکەوێت •• ، لەگۆشەی لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەلایەتیەوە هاوکاری کرد ، بەشی خۆیی لەمەسەلەکەدا دیاردی کرد ، کەوا ئەنجامەکەی ئەم‌کتێبەیە ! ( بۆ لە هەقە کەوتنە قەقە ) ••!؟

گەرچی مامۆستا ( شیخ رؤوف زهدی )پرسیارێکەو کردویەتی ، بەلام لەناوەرۆك تویێی وەلامدا ، ڕوون کردنەوەیەکی ڕاست‌ودروستی لەبارەی کێشەو بەرەی ( هەقە ) تیا بەدی ئەکرێت‌و ئەدۆزرێتەوە ••

خۆ گوردەواری خۆیشمان وتویانە : ( بەپرسیار بەغداش ئەدۆزریتەوە ٠٠) ! جگە لەمەش پرسیار پێشەکیەکی مەنطیقی ڕاستوڕەوانە بەرەو : پەیپێبردنو ناسین ، و زانین ، هەروەها سەرەتایەکە بۆ جولاندن ، وبزوتنەوە ، عەرەبیش وتویەتی : ( وفی الحركة البركة ) ٠٠!

خوێنەری خۆشەویست : ـ سەبارەت بەوەی کە ئازادیبیرکردنەوە بایەخێکی گرنگو تایبەتی هەیە لەلام ، وەڕێزیشی لێئەنێم ٠٠، چونکە بەشبەحاڵیخۆم لەو باوەڕەدام بێئەم ( ئازادی )یە مرۆڤ لەئادەمیزادیتی ئەشسۆڕێت ٠٠! بۆیە نامەوێ پێشتکەوم بیروڕای خۆم لەسەر وردەبابەتەکانی ناوکتیبەکە دەبڕم ، ئەمەیان بەرەوڕووی خۆت ئەکەمەوە ٠٠، خۆت ئەکەم بە سەرپشك ٠٠، ئەوسا منیش وەکو تۆ، وەکو ئەو هەموخوێنەرانە ٠٠، حەز ئەکەم کە مامۆستا (شیخ رؤوف زهدی) سەرکەوتو بوبێت ، لەپێشکەش کردن و دەربڕین و دەرخستنی ڕاستی ، لەکێشەی بەرەیەکدا ،، کەوا بێگانەو نانخۆرو ، و شکەمزەکانیان ٠٠!! بۆ مەبەسی خۆیان وەکو مەتەڵێك ، تا ماوەیەکی دوورو درێژ لە ( هیچە ) خۆمانیپێوە خەریك کردبو ٠٠ ، خۆیشی پشتێنی لێکردبوەوە ٠٠!

## ( ١ )

کتێبەکەی مامۆستا ( مصطفی عسکری )م خوێندەوە ، کە بەناوو نیشانی : ( ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە )یە لەگەڵ پەراوێزەکانیدا کە مامۆستا ( محمد ملا کریم )نوسیبوی‌و دووپێشەکیش کە مامۆستا ( حمزة عبدالله )و دوکتۆر ( عزالدین مصطفی رسوڵ ) نوسیبویان •
لەڕاستیدا ئەم ئاوڕلێدانەوەیەو بەسەرکردنەوەیە ، بۆ ئەم جۆرە بزوتنەوانە ، سەرتایەکی زۆرباشە ، خۆزگە لەبابەت ئەم‌بزوتنەوانەوە ، نەك هەر بەسەرکردنەوەو ئاوڕ لێدانەوە ، بەڵکو بایەخێکی تەواویان پێ ئەدرا ، چونکە ئەم چەشنە ڕووداوانە : هاوارە ، سکاڵایە ودەربڕینی بەرەژانێکی گەلەکەمانە ••!

لەگەلێك شوێنی ئەم‌کوردوستانەماندا ، هاوار ، سکاڵا ، بزوتنەوەو چالاکی لەناو ستەم‌و دەستدرێژی کڵپەی کردوە ••، دەستدرێژو ستەمکاریش خەڵکی هیچ لایەکی‌ترو بێگانە ، وەیا لە میللەتێکی‌تر نەبون ، بەڵکو ( ماڵخۆ )بون ، دیارە قوربانی و نێچیرەکانیشیان ، جەماوەرو کەسانی میللەتەکە خۆیان بون ، تەنانەت ئەم ستەمکارە ماڵخۆانە پردو بەردەبازی ستەمکارانی بیگانە بون لەکۆڵەوارو کەساس‌کردنی میللەتەکەیاندا ، پێشینانیشمان وتویانە : ( کەروێشکی وڵات بە تانجی

وڵات ڕاو دەکرێت ..! ) ئیتر کەکـــار لەکارترازاوەو میللەتەکـــەی خۆیانیان بەیدەستو کەساس کردوە ، نۆبــە هاتۆتــە سەرئەوانیشــ ، بە( تەڵە )کەوە بون ! ئەوسا بارەیان لێ‌هەڵساوە ، وەیا گلەیــی بەختــی خۆیانیــان کردوە ، لــەم بارەشیانــدا داخو زوخــاوی خۆیانیــان هەربە میللەتەکەیان ڕشتوە ..! بەشایانی ســەرداریو پێشەوایەتــی خۆیانیــان نەزانیوە ، وەیا پێشەوایەتیو لێ‌هاتویــی خۆیانیــان بەلایەقی‌میللەتەکــە نەدیوە ..!

زۆرجار ئەم هاواروســکاڵاو بێزاریــە شێوازێــکی توندو تیــژی گرتوە ، ئەمــە بە پێی دەلاقــەی برینەکــەو تونــدو تیــژی ئازاری دەستدرێژیو ستەمەکەی کــەوا ئەنجامەکەی کــوێرەوەری بــوە ..، وەبۆ لابردنیو چارەسەر کردنی بەکورتی بۆ بەرگــری لە خۆکــردنو خۆپاراستن دەســتدراوەتە چەك ، وەکو ڕاپەڕینەکەی دێی ( وەڕاز ) لەناوچــەی شــارباژێڕ لەساڵــی ١٩٤١/١٩٤٢ ، هــەروەها ڕاپەڕینــی فەلاحەکانی دێهاتی ( دۆڵێ ) ، و دێی ( گاپیلۆن ) لەهەمان ناوچەدا لــە ساڵی١٩٤٥دا .

لە ساڵی ١٩٤٧ لەدێی ( ماوەت ) مامۆستا بــوم ، لەگــەڵ مودیــری ناحیەی ماوەتدا خوالێ‌خۆشبو (حمە جمیل رضا)و مامۆستا (ع.ح.ب)دا چوین بۆ دێی ( گاپیلۆن ) ،لەوێ کەلاوەی خانویەکم دی ، کــە هــی ئاغا بو کەوا فەلاحەکان لێی هەڵسابون ، دەریان کردبو ، خانوەکەشیان تێك‌دابو ، لەکابرایەکم پرسی ، لەدوایدا زانیم لــە ( هەقە )کانــە .. پێم‌وت : ئەم خانوەگــەورەیە کــە بە بێــگارو شانو قۆڵــی خۆتــان دروست‌کراوە بۆچی‌ڕوخاندتان ؟! خۆتان بە کــارتان بهێنــایە ، وەیــان داواتان لەمیری بکردایە ، کەبیکات بەقوتابخانە ، وەیا تیمارگە (مستوصف)

باشتر ئەبو ••! وا دیاربو کاکی (هـەقە) قسەکـەمی بـەدڵ نـەبو ، بەلا لووتێـکەوە ، وەڵامی دامەوە کە زۆر بەزەقی ڕقی ڕەوای چینایەتی تێـدا دیاربو ، ئەوسا لەگفتوگۆدا وشەی مامۆستا بەکـارنەدەهێنرا ، ووتـی : ئەفەندی : تا ئاغا چاوی لەم کۆشكو تەلارە بوایە ، هەر بەتەمای هاتنـەوە دەبو ••، بۆیە ڕوخاندمان تا جارێـکیتر بەتەمای هاتنەوە نەبێت ••!

ئەوەندەی لـەبیرم مابێت لە ساڵانی ١٩٣٥/١٩٣٦دا خوالێ خۆشبو ( شیخ محمد زهدی ) باوکم لەسەرگەڵو مامۆستا بۆ ، خۆیشم لەوێ لەپۆلی سێیەم ، وەیا چوارەمی سەرەتایی قوتابی بوم ••، سەرگەڵـو دێیەکـی خۆشـبو : کـەوتۆتە ناو دۆ لێـکە وە ، ئاودار ••، لـە بـەر ئەوەی کە زەوی تەختیان کەمبو ، دانەوێڵەی کـەم لێ دەکـرا • بۆیـە بایەخیان دابو ، بە ڕەز ، و داری بەری ، لەناو چەمەکانیشیدا سپیدارو داربییەکی ئێجگار زۆری هەبو ••، دانیشتوانی گورجو گۆڵبون ، چونکە ڕەزو باخ هەمیشە پێویستی بە چنگە کرێو فرمان هەیە ، بەپێچەوانەی کشتوکاڵـی دانەوێڵەوە ، کەوا ئەرکێـکی ئەتۆی نییـە ، کەمێـکیشـ ئـاژەڵو مەڕوماڵاتیان هەبو بـە تایبەتـی بزنەمـەرەز ، و وڵاغـی بـاری وەکـو گوێدرێژو ئیستر ••، چونکـە کاروانیان دەکـرد ، بەرهەمـی ڕەزو باخەکانیان وەکو : مێوژ ، دۆشاو ، باسوق ، سجوقو وشکەمیوە • هتد دەیانبرد بۆ دەوروبەری کەرکوكو گەرمیان تـا ( حـەوتتەغـار ) و خوارتریش دەچون ••، ئەمبەرهەمانەیان دەگۆڕیەوە بەدەغڵو دان ، هەمیشە کەندوی ناو ماڵیان پڕبولەگەنمی ناوچەی گەرمیان ، چەند پیشە سازیەکی ، دەسـتکردو سـادەشـی تێـدابو ، وەکـو : ئاسنگەریو ناڵبەندیو دارتاشیو جۆلایی ، و هەلاجی ، هەروەها وەستایەکی هەورامی لێبو کڵاشی پەڕۆی دروست دەکرد ، بێپێناسی پیشەکەی پێیان دەوت : ( وەیس )ە ، چەند کەسێکیش بۆپێداویستی ماڵ لەناوماڵەکانیاندا دوکانیان



دێ سەرگەڵو

هەبو وەكو : ( وەستاسمایلی خەیات ، و حمە امیـنی حاجـی ) ، لەدامو دەزگای میریشدا جگەلە قوتابخانە ، مەخفەریـكی پۆلیسو دایەرەیەكـی ( استهلاك )ی تێدابو •

خەڵـكی سەرگەڵو : هێمنو لەسەرخوو ڕەنجدەربون ، بەدەگمەن لەناو خۆیاندا شەڕو هەرایان ببوایە •• جاروبار ، ڕاچڵەكیـنو هـاواری ( هەقە )لە لایەن چەند سۆفیەكەوە ، وەیا قیژەی شیێتێـكی ڕاستەقینە كـە ( حەمەجوجە )یان پێ دەوت كەوا هەمیشە لەناو شیوەكـانی نـاو دێـدا بەسـەری قوتـیو پـێی پەتـی دەسـوڕایـەوە ••، وەیـان زەڕینـی گوێدرێژێك ، كـــە گوێدرێژەكانی تری خـەبەر دار دەكردەوەو بۆ یەكترین دەسـەندەوە لەگەرەكی ( ونسێوبەرڕۆژ )دا ، دەبو بەهـەراو گۆڵمەزی زەڕین ••! لەمە بەولاوە هیچی تر نەبو كە خامۆشی و بێدەنگی ئەم دێ سازگارە بوروژێنێت •••

بەچیاو دۆڵەكانی یەوە گەلێك دیمەنو شوێنەواری سەیری كرداری داماڵینو داخوران ( التعریە والتآكل )هەیە ، لەمانـە شـوێنێك كەپێی دەڵێن ( كونتێلە ) نزیك ڕێبـازی ( قەرەتیكان ) بـە زنجیـرە چیاكـەی ( دابانەوە ) •• هەروەها ئەشكەوتێـكیش لە دامێنی دێدا هـەیە ، پێی دەڵێن : ( ئەشكەوتی تەشوێ تاش ) • بەڕاستی ئەشكەوتەكە ، دەرگـاو دیوارەكانی ئەوەندە ڕێكوپێكبو لەئەشـكەوتێك ، نەدەچـو ، كـە لـە ئەنجامی ( جیۆلۆجیە )وە دروست بوبێت ، دوور نی یە لە كۆندا پەرستگە نەبوبێت •

چوینە سەرگەڵو تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی هەبو •• مامۆستایەكی خەڵكی ( موصل )مان بۆهات ناوی (انطوان قصیر )بو ، وەكو نازناوەكەی كورتە بالا نەبو : لاوێـكی سوروسپیو مووزەردو چاوشین گوایا لـە



ئەشکەوتی تەشوێتاش

فەرەنسە خوێندبوی ، بۆیە هاتبوە سەرگەڵو تا لەڕەوشتی (هەقە)کان شتێك بزانێت ! هەرکە هات وەکو دەستوری سۆفی ئەم ناوچەیەو کۆنەڕادیکالیەکانی فەرەنسەو ئەندامە دێرینەکانی پارتی ( ماپای ) جولەکە، تەنکە سمێڵێك و ڕیشێکی تۆپزی قەڵەم کراوی هێشتەوە ..! باوەڕ ناکەم ئەم ڕیشەی بەکەڵکی ئیشەکەی هاتبێت ، چونکە کوردی نەدەزانی ، دیارە بەزمانی (هەقە)کانیشی نەزانیوە ،،

لەلاپەڕە ( ٤٧ ) پەراوێز (٥٠) بە زمانی کاك ( شیخ حسین )ی خانەقاوەیە دەڵێت : ( هەقە )کان حەزیان لە خوێندن نەکردوە ، بەلام لەڕاستیدا گەلێك لە کوڕە شێخانی سەربە ( هەقە ) لەگەڵ خۆمدا قوتابی بون وەکو ( شیخ عبدالرحمن)ی کوڕی شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەو خوا لێخۆشبو ( شیخ مصطفی)ی کوڕی مامەڕەزا ) ، ژمارەی قوتابیانی ئەوسای سەرگەڵو دەگەیشتە ( ٣٠تا٤٠ )قوتابی کەئەمە ژمارەیەکی زۆر باشە لەچاو ڕێڕەوی ئەوسای خوێندن‌دا . وا بزانم یەکەمجار بوە لە مێژووی پەیوەندایەتی‌و چالاکی تێو قوتابیاندا لەپارێزگای سولەیمانی ، کە قوتابیانی سەرگەڵو گەشتێکی قوتابیانەیان ساز کردبو ، هەندێکیان بەپێ‌و هەندێکیان بەسواری ولاغ بەدیدەنی‌و سەردان هاتن بۆلای قوتابیانی قوتابخانەی سورداش ، ئەمە لە کاتیکدا بوە کە خوالێخۆشبو مامۆستا ( سعید صدقی کابان ) مامۆستا بولە سەرگەڵو ، هەروەها باوکم وەکو مامۆستایەك هیچ کێشەیەکی ئەوتۆی نەبوە لەبابەت نەهاتنی قوتابیەوە ( غیاب الطلاب ) ، کە ئاسایی‌و ڕەمەکی توشی مامۆستا دێت چ لە شارو چ لەلادێدا ، کە ئەمە گێج‌و ترمۆمێتری حەزکردن وەیا حەزنەکردن لەخوێندنە . لە بیرمە گەلێك‌جار خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە چ بە نوسین ، چ بەدەم تکای لەباوکم دەکرد کە کوڕەکەی ئەو لەقوتابیەکانی‌تر جیا نەکاتەوە چونکە کوڕی ئەوەو کوڕی شێخە ، وە

وشه ئاسایەکەی کە ڕەمەکی باوکی قوتابی بەرامبەر بەماموستا دەی‌لێت دوویات دەکردەوەو دەیفەرمو : ( گۆشتەکەی بۆ تۆ ..، ئێسقانەکەی بۆ من ..!! )

ئەگەر بە دڵ بەراوردێکی ئەم هەڵوێستە بکەین لەلایەن سەرکردەو پیری (هەقە) کانەوە لەساڵی **١٩٣٥**دا لەگەڵ هەڵوێستو کردەوەی زوربەی ئاغادێکاندا لەساڵی **١٩٥٥** واتە دوای بیست‌ساڵ لەگۆڕان‌و پێشکەوتندا ، کە خەڵکی دێهاتەکانی ئەمان دەهاتن بە ( عریضە ) داوای کردنەوەی قوتابخانەیان دەکردو ئەمانیش چۆن بەرهەڵستیان کردون ، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت کە (هەقە) کان لەساڵی **١٩٣٥**دا بە تایبەتی پیرو شێخەکانیان ، چەند دڵفراوان‌و کراوەتربون بەرامبەر بە خوێندن‌و قوتابخانە لەچاو ئاغادێکاندا ..

لەساڵی ١٥٩٥ . خۆ ئەگەر لەناو ئەم ئاغادێیانەدا هەبوبێت بەرهەڵستی کردنەوەی قوتابخانەی نەکردبێت لەدێکەیدا ، لەوباوەڕەدام لەبەرئەوە بوە کە کۆلیتەخانویەکی هەبوە بەتەمای بەکرێ دانی‌بوە ، بەقوتابخانە ، وە یا پێشەکی پارەی مانگانەی فەراشی قوتابخانەکەی بۆخۆی مسۆگەر کردوە ! ئەوی شایانی باسە : گەلێکی‌تر لەکوڕەشێخانی سەربە (هەقە) لەگەڵ خۆمدا قوتابی بوین وەکو (عبدالقادری کوڕی شیخ عبداللەی عسکر)وە (سید احمدی)برای کەپێمان دەوت ( سەیدە ) ئەم‌قوتابی‌یە کزولاوازبو ، وا دیاربو نەخۆشە، بەڵام ( عبدالقادری )برای هوتەرمەندو زۆر وردبولە وێنەو ئیشی‌دەستدا ، لەوەرزشیشدا چالاك‌بو بەتایبەتی لە سێ‌بازو سنگەوبازەکەیدا ، هەروەها ( مامەقالە )ی کوڕی ( حاجی شیخ عارف )یش قوتابی بو لەگەڵماندا بۆ تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی چو بۆ کرکوك .. با زیاتر لەسەری نەڕۆم چونکە مرۆڤ هەرگیز لەگێڕانەوەی یادی منداڵ تێر نا خوات بەتایبەتی کەماڵئاوایی لەتەمەنی لاوی کردبێت ..!

( ٢ )

ڕاسته (هەقە)کان وەکو خاوەن تەریقەتە کلاسیکیەکان ڕۆمانسی نەبون کە هەر تەنها بەبابەتی ( ذکر وفکر )ەوە خەریك •• سا بەشکو زوو پێبگەن و بچنە ڕیزی ( نێرڤانا Nirvana )وە ئیتر پێویستیان بەتفاقی دنیایی نەمێنێت ••! لەم دوایەدا سۆفیەکی (هەقـە)م دوانـدو ، لێم پرسی : ئێوە خاوەن تەریقەتن کەچی لەبە ئەنجـام گەیاندنـی داب و دەستوری ئاینیدا کەمتەرخەمن بۆیە لەگشت لایەکەوە پەلامار دەدرێن ••! کابرای (هەقە) گەرچی بێسەوادیشـ بو بـەلام بەلـگەو بەهانەکـەی ڕاستیەکی تێدابو وتی : ( کەسی کاکی وەکـو دەیزانیـت « دنیا »پێشـ ( قیامەت ) کەوتوە لێپرسینەوە لە قیامـەتدا لەسـەر کـردەوەی ئـەم دنیایەمانە •• ئەگەر لێرە کردەوەمان خراپ بێت ، ئیتر لـەوێ بەتەمـای چی بین ••!؟ ئینجـا لەبابـەت ( نوێژو ڕۆژوە )وە ، وتـی : ئـەم دوو پەیڕەوە لە نان بەسەزمان ترن هەمو کەسێك پێـیان دەوێرێت •• دەتوانێت بیان کات ، گەرچی بەڕواڵەت و سەرزارەکی وە یا بۆچاو بەست بێت •••! خۆ ئەگەر کەسێك ڕەوشت و کردەوە خراپ و بـە دبێـت ، ناشیرینە بەسەرتێ کردنی ئەم دوو پەیڕەوەوە خۆی هەڵـکێشێت ، کـە ئەنجامەکەی دەبێتە سوکایەتیەك دەربارەیـان چونکـە ڕەوشـت نزمێـك

دەی‌کات بە کوتەکی دەستی ،ونان‌وپیازی پێوە دەخوات ..! ) ـ تەواو ـ

لەم بۆچونەدا ئەم (هەقە) لەدەستەوتاقمی ( کویکرز Quakers ) دەچن ، کە لەبەر دەغەڵی‌و داخی ناپاکـی ئایـن پەروەرەکانیان بەلای هیـچ پەیرەوێکی ئاینیدا (Lituragy) نەدەچون بۆیە (هەقە )کان لـەڕێڕەوی تەسەوفیاندا ڕیالیزمیەکیان (Realism) ( واقیعی ) ، تێدابو چونکـە دەمیان لەکێشەی کۆمەڵایەتیەوە دەدا ، وەکو (هـەق)و یەکسـانی‌و چونیەکی‌و ویژدان .. هتد ) بەڵام هەر لەچوار چێوەی ئەو فەلسەفەیەدا کە ڕێبازی تەسەوفی لێوە پەیدابوەو هاتۆتە گۆڕێ .. بەڵـێ کێشـەی کۆمەڵایەتی ، بە پێی باری ژیانی کۆمـەڵایەتی ئەوسـاو دەق‌گـرتن‌و بەمەینەتی‌و کوێرەوەریەکانی‌یەوە .

بەش‌بەحاڵی خۆم لەوێ گەلێك چیرۆکی سامناك‌و پڕستەمم بیستوە وەکو چیرۆك‌و بەسەرهاتەکەی (خاتوخوبی)ئەمە هەرلە ڕاستیدا چیرۆکی ڕووتی نی‌یە کەلە کوڵۆڵی‌و مەینـەتی خەڵـکیەوە تاکە کەسێك دروستی کردبێت وەیا هەڵی بەستبێت ، تا هەستی مرۆڤ ، بەچاك یان یە خراپ پێ بجوڵێنێت ..! ئەم بەسەرهاتە کارەساتێـکی دراماتیکیـە کـە لایەنێـکی مێژووی چۆنێتی ژیان‌و گوزەرانی خەڵـکی ئەو سەردەمەی ناوچـەی ( هەقە)کان دەردەخـات‌و جێ‌پەنجـەی سـتەمکاری پێوەیـە .. ئـەم ئافرەتە ( خاتوخوبی ) چەند کوڕێکی ئازاو لاوچاکی دەبێت ، مایەی هیواو ئاواتی دایکیان دەبن ..! ئینجا لایەنە دراماتیکیەکـەی چیرۆکـە کـە دێتە پێشەوە .. ئەم کوڕانە ئەگـەر ڕاست‌و چـەپی خۆیان بناسن دەبنە ( ئەولای‌ئالی )(١) ولاسایی ئەم دەکەنەوەو شەقڵی ستەمکار دەشـکێنن‌و

(١) ئەم پیاوە خەڵـکی دێی بەردمشانە ، لە ناوچەی مەرگەدا لە خێلی شیلانەیە ...، بە ئازایەتی‌و لێهاتویی خۆی مەردانە بەرهەڵستی دەستدرێژی ئاغایانی .. ناوچە کەی خۆیی دەکرد لـە سەردەمی خۆیدا .



ڕێبازی قەرەنیکان ‎٠٠‎ و گونتێلە

لێیان دەبنە مووی لووت••! دەبا خێرا فریا کەون ، زوو لەباڵیان بدەن••،
ئەم ڕۆڵانە زۆر بەنامەردی لەبەرچاوی دایکیان دەکوژرێن •! ئنجا بۆ
ئەوەی ( خاتوخوبی ) ئەم نەهێنی‌یە نەدرکێنێت دێن زمانی لەبندا دەبڕن ،
چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوە •• ئیتر کۆچی دوایی دەکات ، وەکو
دەیان گێڕایەوە لاشەکەی فڕێ دەدەنە گۆمێك لەگۆمەکانی ئاشەکانی
بەرگەلو ، کەوا لەدامێنی سەرگەلودایە باوەڕناکەم نەهێنی‌یەك پەیوەندی
بەبون‌ونەبونی مروڤەوە هەبێت ، هەتاهەتایە شاروراوە بێت ••! (خاتوخوبی)
بەسەزمان ، وبێ‌زمان ! بوبە نمونەو پەندی پسان کە هەرگیز کەس
نەخەڵەتی‌و نەوێرێ بەکوڕوکاڵیەوە پۆز لێبدات •• زوڵم‌و ستەم شتێکی
نەمرە ، ستەمکاریش نازدارە !! نابێ کەس پێی بڵێت پێی خوار داناوە ••
ئاوی زاڵم لە یاسای فیزیا بەدەرە ، سەربەرەو ژووریش دەڕوات !! بۆیە
ستەمکار کوردواتەنی وەکو ( حەچەی نەتێ ! ) هەر دەبێت بەکوڵ
خەڵکەوە بێت ، مەگەر خۆی خەو بی‌باتەوە دەست‌و قاچی شل بێتەوە ،
لە خۆیەوە بکەوێتە خوارەوە ، وەکو لەئەفسانە کوردەواریە کەی
خۆماندا هەیە ••• هتد ( هەقە )یەتی لەم مەڵبەندەدا پەیدابو ، بۆیە
سەری لەهەندێ شتی کۆمەلایەتی دەخورا ••، بۆیە یاخی‌بون‌و
سەرپێچی‌و ( شێتی )بو ، بەلام هەربە ناوی مەسەلە دێرینەکەو لەپەنای
ئەمدا ••

## ( ٣ )

سیناریۆ و دەرهێنانی لادانی ( هەقـە )کان لەچی‌یـەوە هاتوە ..!؟ «هەقە»یەتی وەکو بزوتنەوەیەك لەناو قاوغی مەسەلەپێشینەکـەدا ، نـەك جیاوازوسەربەخۆ لـەو ، بەڵکو شتێکی ئەوتۆ نەبو کە شایانی ئەوە بێت، بەو جۆرە تیروشیری لێ‌بسووێت‌و دووچاری ئەو هەمو بوختان‌و درۆو دەلەسەیە ببێت ..، بەڵام سەبارەت بەوەی کەوا ڕێبازەکانی‌تری کەلەگەڵ (هەقە)یەتیدا لەبەرەیەکـدان هـەمان دەستور مونافیسی‌شـیانن دەمێك بۆ پێداویستی ژیان‌و گوزەرانی کۆمەڵایەتی لەمانای (داوەری‌و یەکسانی‌و ڕەواو هەق‌و ویژدان .. هتد ) ڕووتی کردبونەوە ، لەتوێژاڵێـکی تەنك بەولاوە هیچی تریان پێوە نەمابو ، بەتایبەتی غەمخۆرو ( شێخ‌وپیری ) ئەو ڕێبازانە ، تەنانەت جەماوەرەکـەی سەربەخۆیـان ــ مریـدو مەنسوب‌و مەحسوب ــ بەچاکی کەم‌و کوڕی‌و خەوشی ( عیب )دەبینیـن‌و لێ‌یـان کەوتبونە فاك‌وفیك‌و گومانەوە ، گومانێك کە سەرەتای کزبونـی باوەڕە ــ هەرباوەڕێك بێت ــ وە هەنگاوی یەکەمە بۆ تێکەیشتنی ڕاستی وەیا تێك‌دان‌و شێواندنی ..! گومانێك کەگوایا : ڕاست بێت ئەمانە پەیـام هێنـەری چاکـەو دادو ڕەواو پێشمـەر گـەی ڕێـگای (هـەق هەق‌پەروەری )بن بۆیە ( هەقە )کان بەهەق هەقەوە گرتبونی ..! خوا

لێ‌خۆشبو «شێخ رضا»ی تاڵەبانی توێژاڵە تەنکەکەی ئەم بەزمو ڕەزمانە دادەدڕێت‌و دەفەرموێت :

گەر ئاغان •• و گەرمەلان‌و •• گەر شێخان

هەر فەقیر •• انە ، فەقیر •• انە ، فەقیر •• ان

ئەوی شایانی باسە خوالێ‌خۆشبو ( شیخ رضا )ی تاڵەبانی لەبنەماڵەی شێخێکە لە شێخانی یەکێك لەو ڕێبازانە کەوا لەنزیکەوە شارەزای نهێنی پیشەکە بوبو ، نهێنی‌یەك کەوا پەیوەندی بەپێداویستی باری ژیانی‌و گوزەرانی کۆمەڵایەتی ،و بیرو باوە ڕەکانیەوە هەبێت‌و لەمەوە هەڵقولاێت ، وەبۆ سودی ئەم هاتبێتە ئاراە ، بۆیە لەلایەکی تردا دەفەرموێت :

لازمە بۆ شێخ بەیانیان گورگەخەو ،

تا بڵێن شێخ عابیدەو نانوێت بەشەو ••!

سەرەڕای ئەمە خوالێ‌خۆشبو ( شیخ رضای تاڵەبانی ) خۆیشی پیاوێکی خاوەن هەست‌و هەست‌ناسك‌و ڕەخنە گرێکی وردبو ، کرمی لەپەنجەی ساغ دەردەهێنا ••! هەروەها خوالێ‌خۆشبوش ( ملا محمد)ی جەلی‌زادەی کۆیە ــ مەلای گەورە ــ لەڕووی نەتەوایەتیەوە ، کەبارێکی‌تری ژیانی کۆمەڵایەتیە ، پەردە لەم کەین‌و بەینە لا دەدات ودەفەرموێت :

تا لەکوردستاندا شێخێ بمێنێ

ئومێدی زیندەگانیت پێ‌نەمێنێ ••!

بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێت کەلەناو ئەم کۆڕو تاقمەدا ، پیاو چاك

نی‌یه‌و بۆ پێداویستی ژیان‌و گوزه‌رانی‌خۆی‌و ده‌سه‌ڵاتی له‌ناو کۆمه‌ڵگه‌دا هه‌موشتێك ده‌نێته لاوه ! ئه‌وه‌تا خوالێ‌خۆشبو ( شیخ سراج‌الدین‌ی نه‌قشبه‌ندی ) ، ( رضا شای په‌هله‌وی ) دێت به ناوی ئاین‌په‌روه‌ری خۆی‌و ڕێزلێ‌نانی شێخه‌وه !! ده‌یه‌وێت (شێخ)بکات به ده‌ست که‌لا ، و « موفتی » کرده‌وه ناهه‌مواره‌کانی خۆی ...، تکا له‌شێخ ده‌کات که قایل بێت موچه‌و مانگانه‌یه‌ك بۆ خانه‌قاکه‌ی ئه‌م ببڕێته‌وه،شێخ مه‌ردانه دێته وه ده‌ست نایه‌وێت خۆی بدات به‌ده‌سته‌وه ، و له‌گه‌ڵ خۆیدا یاوه‌ڕه‌که‌شی خه‌ڵك‌سوك وڕسوا کات ..! به‌و په‌ڕی ئازایه‌تیه‌وه ، وه‌ڵامی ( ڕضاشاه ) ده‌داته‌وه‌و ده‌فه‌رموێ : ( ما آبروی فقرو قناعت نمی‌بریم که‌ڕۆزی مقرر است ) .. واته ئێمه هه‌ژاری‌و قه‌ناعه‌ت شه‌رمه‌زار ناکه‌ین مادام ڕزق‌و ئازوقه بڕیار درابێت .!! هه‌روه‌ها خوا لێ‌خۆشبو ( شێخ عمری ضیاءالدین )یش له وه‌ڵامی نامه‌یه‌کیدا ، که بۆخوالێ‌خۆشبو ( حاجی مه‌لاعبدالله )ی جه‌لی زاده‌ی نوسیوه .. دوای ڕوون‌کردنه‌وه‌و لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ك له‌باره‌ی چۆنێتی کاروباری ژیان‌و گوزه‌ران‌و ئامۆژگاری کردن ، له‌کۆتاییدا پرسیار ده‌کات‌و ده‌فه‌رموێ : ( دگر به‌دونان برای دونان دویدن چه فایده ، وا زیار به‌اغیار گرویدن چه‌قاعده .. )! ــ یادی مه‌ردان ــ به‌رگی دووه‌م دانه‌ری مامۆستا ( مه‌لا عبدالکریمی مدرس )لاپه‌ڕه ( ٢٤٠ ) ــ واته : ( ئیتر له‌پێناوی دوونان‌دا ، دواکه‌وتنی پیاوخراپ‌و ناکه‌س‌به‌چه ، چ که‌ڵکێکی هه‌یه وه‌ئالوده‌و هۆگربونی غه‌واره‌و بێگانه‌و کردنی به دۆست‌و ئاشناچ وێڵ‌و په‌یڕه‌وێکه !! )ئیتر مه‌سه‌له‌که هه‌رچۆنێك بێت مرۆڤ ناتوانێت ڕێز له‌م زاتانه ، نه‌نێت ، چونکه ڕێزی خۆیانیان پاراستوه ..! به‌ڵام به داخه‌وه ئه‌م پیاوانه ماوه‌یان کورته ، به‌نه‌مانی خۆیان هه‌مو کاروبارێك ده‌چێته‌وه دۆخێکی‌ترو ، ژێر ڕکێفی‌پێداویستی ژیان‌و گوزه‌ران‌و که‌ش‌وفشی ده‌سه‌ڵاتی ناو کۆمه‌ڵگه .. ئنجا وه‌چه‌و جێ‌نشینیش

هەزار هالاوی بە پلاویك نەداوە ..!

دەسەلات ئەگەر خۆش گوزەرانی خاوەنەکەیی لێ دەرکەین ، کەوا پارووی خاو ناخاتە دەمی ..، گەلێك شتدەگرێتەوەو دەگەیەنێت ..! بەتایبەتی لای ئەوانەی کە دەکەونە بەرقەمچو سنوری دەسەلاتەکەوە ، گرنگەکەیان : داوەری ( العدالة )و یەکسانی‌یە ، خۆ ئەگەر هاتو دەسەلات فڕی بەسەر ئەم دوانەوە نەما تەنها کەش‌وفش و خۆبادانەکەی دەمێنێتەوە بەسەر خەڵکەوە ، کە ئەمەش بێزوبێزاری خەڵکە کە دەجوڵێنێت ! بە تایبەتی ئەگەر دەسەلاتەکە سەرومڕو بێ لێپرسینەوە بێت ، ئەوسا نەك هەر زیان بەخش دەبێتو زیانی خەڵکی دەخاتە مەترسیەوەو گوزەرانیان سەغڵەت دەکات بەڵکو خاوەن دەسەلاتیش نازدارو بەدخو دەکاتو لەڕووی کۆمەلایەتیەوە نەگریس‌و ناشیرین دەبێت ..!

کەوابو دەتوانین بڵێین (هەقە)یەتی دەمەزەرد کردنەوەیەكبۆ بۆ ئەو ڕێبازانەی کە وەکو خۆی لەیەك سەرچاوەی فەلسەفیەوە هاتبون ، دوای ئەوەی کەپێداویستی ژیانو گوزەرانی ناوکۆمەڵگەو بریق‌وباقی دەسەلات کولی کردبون !! تەنانەت تەوژمیان لەناو ( مریدو مەنسوب‌و مەحسوبە )کانیاندا هاتبوە کزی ...، بۆیە ( هەقە )یەتی چەردەیەك لەکێشەی کۆمەلایەتی وەکو ( یەکسانی ، هاوبەشی ، داوەری ، ناڕەواو ناهەق‌وهەقی) تێداد دووپات دەکرایەوە بەلام بەشێوەیەکی ساکار .. لەم ڕووەوە مامۆستایان ( حمزة عبدالله )و ( محمدی ملا کریم ) باش بۆ بابەتی ( هەقە )یەتی چوبون ، لەکتێبەکەی‌مامۆستا ( مصطفی عسکری )دا – ئاوردانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە – .

سەبارەت بەوەی کە مەسەلە ئابوریەکەو ( هاوبەشێتی )یەکەیان

ـ گەرچی بەشێوەیەکی ساکاریش بو ـ تاڕادەیەك مسۆگەریەکی ژیانو گوزەرانی بۆ هێنابونە گایەوە ، لەبەر ئەوەی ( هەقە )کانیشــ زوربــەی زۆریان ، فەلاحو جوتیارو هەژاری لادێ بون ، هەرچی زەبرو زەنگــی چەرخی چەپگەردو ستەمگەرو نەهاتی هەیە لەپێشدا ئەمان دەگرێتەوە ..!
بۆیە ژیانە کۆمەڵایەتیەکەی کەبەم هاوبەشێتیو یەکســـانیەوە بەنــدەوە کۆمەڵــگەکەیانی لەسەر دروستبوە (Social Stracture) کارێــکـــی وای تێ‌کردبــون ، دڵبــەندی بوبون ، چونــکەلە کوێرەوەریو مەینەتی ـ تاڕادەیەك ـ دەیپاراستنو خۆیان بەنان خــۆری سەرسینیو خوانێــك دەزانی بۆیە نێرومێیان دڵیان لەیەکتری پیس نەدەکرد ، مەگەر غەریبو غەوارە بکەوتایە ناویان ، ڕێبازی داوێن پیسیو لادانیپیشان بدانایە ! ئەو لادانو تاوانەی کەوا لەزەمانی ( هابیلو قابیل )ەوە بــەدزی وبەئاشــکرا هەرهەیە ..!!

ئیتر ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیەیان کەوا « هاوبەشێتیو تەبایە »کــەیان بناغــە ئابوریەکــەی بو ..، وە لەئێشــو فرمــانو بەرهــەم هێنانیشــدا هەرەوەزیەکی سادەو ساکــار دەوری تێدا دەبینــی ، وە لەبەکارهێنــانو سود لێوەرگرتنی بەرهــەمیشدا جۆرێــك لەڕەوشــتی گشــتی بەرەیەك (Grup Behaviour) خۆی تێدا دەنوانــد .. هتــد ، بویــە لــەچاو کۆمەڵــگە فراوانەکەدا تۆزێك ڕەوشتو کردەوەیان جیــاوازبو .. ئــەم ڕەوشتە گشتیەیان بەرژەوەندی هەمو ئەندامێــکیانی بەنێرو مــێوە لــە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکەیاندا توانــدبوەوە .. وە لــەڕووی سایکۆجیەتــی سێکۆلۆجیاشەوە گەلێك کاری تی‌کردبون هەڵەی (Impulse) نێر مێیانی، سارد کردبوەوە ، چونکە خۆیان بەئەندامی یەك‌خێــزان دەزانــی کــەوا ( نانو نمەك لەبەیندایە .. )! لەم لایەنەوە ئافرەتە ( ڕێدار ) یە !هەقە)کە بەهەڵەدا نەچوە ئەگەر و تیێتی : نێرومێی ( هەقە ) لەژێر لێفەیەکیشدابن

ـ لاپەڕە (٥٤) ئاوڕدانەوەیەك لـە بزوتنەوەی هەقە ( مصطفی عسکری )ـ کێویك لەبەینیاندایە •• ! یا کێوەکە چڵە پوشێك وەیا زیخێك بێت ، ئەمە وا دە گەیەنێت کە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکەیان ئەوەندە کاریگەرە لەناویاندا، ئارەزووی نێرومێ‌ی سارد کردونەوە •• ئنجالەوانەیە وتـەی ئافرەتـە ( ڕێدار )یەکەو دەربڕینی هەستی بەوشێوەیە ( کنایة ) بوبێت لەپـاکو خاوێن پەیوەندایەتی نێرومێـیان ؟ ئەگینە لـەو باوەڕەدا نیم ئەگـەر کاریگەری ( التأثیر ) مەسەلە کۆمەڵایەتیەکەیـان نەبێـت ، نـەك هـەر کێویـکی مەجازی وەك ( چڵەپوش وەیا زیخ ) بەڵـکو حـەوت کێـوی ڕاستەقینەش ناتوانێت ڕێـگە لەنێرومـێ بگرێت ، وە یا ئەوپاسـە بـە قۆچەقانی بکرێت ••!! چونکە ئەگەر دزو ماڵخۆ یەك بگـرن گا بـــە کلاوڕۆژنەدا سەر دەخـەن •• ! لەگـەڵ ئەوپـەڕی ڕێزمـدا بۆ خـوا لێخۆشبو ( شێخ‌ڕضای تاڵەبانی ) کەوا لـەم بارەیەوە بـە هەڵبەستێـکی دوودێڕی لایەنێـکی زۆر گـرنگ‌و پێشـەکی توانایـەکی فسـیۆلۆجی لەمڕووەوە باش ڕوون کردۆتەوە ••! یا لە ( بێـگانە وەیـا لەخوێشـں ) پرسینی تێدا بێت وەیا نەبێت ، وەکو ئەو باسی‌کردوە ، لەواقیعـدا ئـەم کارە زیاتر پەیوەنـدی بە توانـا فسیۆلۆجیەکـەوە هەیـە ! مەسـەلە کۆمەڵایەتیەکەی لەمەڕ (هەقە)کان گەلێك کاری تـێ کردبو ، سـاردو سڕی کردبوەو •• ! ئایا هەر مەسەلە کۆمەڵایەتیەکـە نی‌یـە کەلەنـاو کۆمەڵـگە فراوانەکشدا سنورو پەرژینـی بۆ پەیوەندایەتـی ژن‌ومێردو نێرومێ داناوە ••• !؟ تەنانەت زۆر کەس پڕ کێشی ناکەن کە (ئامۆزا ، وە یاخزمێـکی نزیکی خۆی بخوازێت کە پێـکەوە ژیاون )یا شەرعیش حەڵاڵی کردبێت •• !

## ( ٤ )

ئیتر ئەو پەیڕەوە کۆمەڵایەتیە بە تینەی کەوا کاری لەمان کردبو ، بەو چەشنە توند پێکەوە بەستبونیەوەو شەیدای بوبون •• ، لەڕێڕەویشیدا دەمودووی ناحەز دەوری تێدا دەبینی ، وە نەبێت تەنها لەناو ئەماندا ڕووی دابێت ، بەڵکو لەسەرەتای گەلێك بزوتنەوەی کۆمەڵایەتێدا ، لەهەنگام و قۆناغێکی دیاردی و تایبەتێدا ، ئەمهۆگری و ئالودەبونە هەرهەیە ••!

ئەوەتا مامۆستای پارێزەر ( جمال بابان ) لەم ڕووەوەو لەبابەت بزوتنەوەی (هەقە)وە ، کەلە ڕۆژنامەی ( العراق )دا ژمارە (٢٣٣٤) ڕۆژی ٩٨٣/١٠/٥ بڵاوکراوەتەوە ، دەڵێت : ( ••• تاکو یەکێکیان بەجۆرێك وەڵامی دامەوە کە بڕوام وابو لەکانی دڵیەوە دێتە دەرەوە کە وتی : ئەوەتەی بوم بە ( هەقە ) پیاوەتیشم نەماوە ••! ) ـ تەواو ـ •

گەرچی مامۆستا ( جمال بابان ئەم حاڵەتەی ( هەقە)کانی داوەتە پاڵ ( ذکروفکر ) کە گوایا ئەمە ئەو لایەنە فسیۆلۆجی یەی لەبیر بردونەوە••• هتد بەڵام بەڕای من ( مەسەلە کۆمەڵایەتیە بە تینەکەیان ) کاری لەم لایەنە فسیۆلۆجیەشیان کردبو ، ئەم چالاکیەیانی هێنابوە کزی ! ئەگینە ئەم ( ذکروفکر )ە لای ڕێبازەکانی تری تەسەوفیش هەر هەیە کەچی ئەو

( ئەرکو پێداویستیە فسیۆلۆجیەشیان ) بەم چەشنەی (هەقە)کـان لـێ ی نەقەوماوەو یەکێ نەکەوتوە ..! ئەمە بە نیسبەت پیاوەکانیاوە ، دیارە بـە نیسبەت ئافرەتەکانیشیانەوە ( هەمانڕا )دروستو بەجێیە ..

دیسانەوە لەبەندی سێیەمی وتارەکەیدا ، کەوا مامۆسـتای بەڕێز کـە خودی خۆی لە ناوچـەی (هەقە)کانـدا ، بەڕێوەبـەری ناوچـەی چناران‌بوە ، دیارە بە زەبری فەرمانبەرایەتیە کـەی ( حکـم الوظیفـة ) پەیوندایەتی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەیدا بە تین‌بوە ، ئیتر لە کاروبارێکی وەها گرنگ‌و ناسکدا لەڕووی دابو دەستوری کۆمەلایەتیەوە ، گوایـا قسەی ناحەزانیش شێوەیەکی تێکڕاییو هێرشی گرتبو ..، لەم حاڵەتەدا شایەتی بەڕێوەبەرەکە ، جێی متمانەیەو شارەزاییەکەیشی بایەخێـکی تایبـەکاری هــەیە ، چ بۆ پاکــانە ، چ بۆ تاوانبـار کــردن ، بۆیە لەم کەلێنەوە مامۆستا ( جمـال بابان ) بـەو پـەڕی ڕەوانبێژیـەوە ( الصراحة ) تێ‌بینیەکانی خۆی ، بێ‌چەندوچونو ئازایانە ، دەربـارەی ڕەوشتی (هەقە)کان دەردەبڕێتو تۆمار دەکات کە دەڵێت :

( سێیەم : ڕەوشت ــ لەگەڵ ئەو هەموقسانەدا کە دوای (هەقە)کان خرابون کە گوایا تێـکەڵاو بونێـکی نابەجێ لەناویاندا هەیـەو کەسـ خاوەن کچ وەیا ژنی خۆی نی‌یە ، من ــ مامۆستا جمال بابان ــ زۆر لـەم چمکەوە سەرنجم ئەدا ، وەك وتم ئێستاش شکاتێك ، یا دەنگ‌دانەوەیەك ، یان ژن‌هەڵـگرتنێك یا شتێـکی ترم نەدی ، بەلام قسەی ناحەزانیشم زۆر ئەبیستەوە ، ئیتر وەکو ئەلێن تاکـو شەرعیشـ « ظـاهر » بینـە .. )

ــ تەواو ــ

لێرەدا ئەوەی کەوا بۆ چاکەی مامۆستا ( جمال بابان )دەبێت تۆمار بکرێت ئەوەیە کەوا ئەم لەم‌باسەدا پشتی بە « ظاهر » بینیەکـەی لەمـەڕ



خانەقاکۆنەکەی شەدەڵە

شـەرع بەستوە ، و تفەنـگی بە تاریکیەوە نەنـاوە •• بۆیـە وا ڕاستو ڕەوان ، بێ پێچوپەنا بۆ مەسەلەکە چوە ، وە لە پێشکەش کردنی دیمەنێکی ڕاستو واقیعدا سەرکەوتو بوە •• ئەو « ظـاهر » بینیـەی کـە دەبـو ، زووتریێش ئەم ، هەر لەسەرەتاوە لەگیرو گرفتی کۆمـەڵایەتیدا ، بـە تایبەتی لە لایەن بە پەرۆشانی شەرعـەوە ، لەپـڕۆ پاغەنـدەی دژ بـە ( هەقە )کاندا ، لەم ڕووەوە ڕێ بەدیی بێ بکرایە •• ئەو « ظاهر »بینینەی کەوا پەیڕەو کردنی ( ناسینو زانین ) دەبەخشێت ، پەیڕەو نەکردنیشی وەیا کەمتەرخەمی تیایدا مایەی ( نەزانی )یە ••، ئنجا شـوێن کـەوتن ، وەیان شوێن پێ هەڵـگرتن ( بێ زانین )وەیان بە ( نەزانین ) گوێچکەو چاوو دڵو دەروونیش ، ئەم ئەندامانە هەموی لەئاستی لێ پرسراون ، وە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیان گرێتەوە : ( ولا تقف مالیس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد کل أولئك کان عنه مسؤولا •• ) ئایەتی (٣٦) سورەی ( الأسراء ) ، ئەو « ظاهر » بینیە بۆیە شەریعەت بایەخی پێداوە ، تاکو کەسـ نەبێتـە نێچیرێـکی بەیدەسـتکراوو دەسـت بەسـەری ( شكو گومان ) ، وەیا قوربانیەکی مردارەو بووی درۆو بوختان !!

تاکو کەس بە دەست ( حەقیقەتو واقیع ) لە لایەك ، لەلایەکـی تریشـەوە بـە دەست بیرو باوەڕەکەی خۆیەوە تێـکڕا دانەمێنێتو گیر نەخوات ، کە سەرئەنجام دووچاری تەنگو چەڵمەیەکی ویژدان (ازمة ضمیر ) (Crisis) بێت ، وە یا لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەو واقیعـەی کە هەیە دوا کەوێتو بێتە سەڵتی دوای کاروان ••! ئنجا خـۆی بـە کەساسو کوڵۆڵ بزانێت ••! سەرەڕای ئەمەش « ظاهر »بینی شێوازێکی ڕاستو دروستی زانیارانەیە •• هەر چەنـدە دوورکەوتنـەوە لە گومانو مەزندە زۆر پێویستە ••، بەڵام تاکو بەشـی ڕاستیشـ لەمەسەلـەکەدا بمێنێتەوە ، و وون نەبێت ، هەندێ گومانو مەزندە ــ نەك هەموی ــ بـە

گوناەو سەرپێچی دراوەتە قەڵەم ، ئەو گومانو مەزندانەی کـە بـەلای حەقیقەتو ڕاستیدا ناچێت •! ( یا ایها الذین آمنوا اجتنبوا کثیرا من الظن ان بعض الظن اثم،ولا تجسسوا ، ولا یغتب بعضکم بعضا ، أیحب احدکم‌ان یأکل لحم اخیه میتا ، فکرهتموه ، واتقوا الله ، ان الله تـواب رحیـم •• ) ئایەتی ( ١٢ ) سورەی ( الحجرات ) •

ئیتر پلەی گومانو مەزندە هەرچۆنێك بێـت دەوری حەقیقـەتو ڕاستی نابێنێتو جێی ناگرێتەوە ، ئـەم ئایەتـە پیرۆزەی تریشـی فڕی گومانو مافی مەزندەی بەسەر حەقیقەت وڕاستیەوە تەواو دەرخستوە ، کە دەفەرموێت : ( ان الظن لا یغنی من الحق شیئا ) ئایـەتی ٤٨ سورەی ( النجم ) •

بەش بەحاڵی خۆم نامەوێت چەندو چون لە کاروبارێکدا بکەم کـە ئەوەندەی خاوەن‌کارو پسپۆڕەکەی شارەزانە بمو کۆڵبم تیایدا ، کورد واتەنی ببمە ( مەلا بەزێن ) ! دیسانەوە ئەوی دەی‌ڵێم هیچ هونەرێـکی تێدانی‌یە ، چونکە کەسانی ساویلکەو ڕەمەکیش پەی پێ دەبەنو شتێکی هەر لێ هەڵدەگرێنن چونکە هەزارو سێ‌صەد ساڵ زیاترە لەم وڵاتانەدا پەیڕەوی دەکرێت ••

بەڵـگە نەویستە ( بدیهی ) کەوا ( حەرام وحەڵاڵ ) لەئیسلامیەتدا ئاشکراو دیارە ، ئیتر ئەوەی لەیەکێـك لـەم دوانـە نەچێـت جـێی ( شك‌وگومانە ) ئەو سادەبێت بە ( ظاهر )بینی لێی وردبرێتەوەو لێی بکۆڵرێتەوە ، تا بەسەر ( حرام )وە یا ( حلال )دا ساغ دەبێتـەوە ، لـەم ڕووەوە پێغەمبەر ( د•خ ) دەفەرموێت : ( الحلال بین والحرام بیـن بینهما مشتبهات •• ) لە ( حدیث الاربعین النـووی ــ للشـیخ زکریـا ــ صحیح البخاری ــ المجلد ١ )•

ئیتر سەبارەت بە هەرچیەك بێت کـە گومانو مەزندە پەیدادەبێتو دێتە ئاراوە و بۆ ئەوەی کەس نەکەوێتە زەلکاوی شكو گومانەوە ، لـەم ڕووەوە پێغەمبەر ( د•خ ) فەرمویەتی : ( ان اللّٰه یحب البصر الناقد عند ورود الشبهات ، والعقل الكامل عند هجوم الشهوات ) ـ احیاء علوم الدین للأمام الغزالی ـ المجلد الرابع ـ لاپەرە (٤٠١) ـ بەڵام وا دیارە کە (حەزو خواستو ئارەزوو •• هتد ) هێرش دێنێتو دێتە کایەوەو هیـوای پـێ شاد بونیان نزیك دەبێتەوە ، ئەو تاسەیە ( الاشتیاق )گڕ لەهەستو گیانـی خاوەنەکەی بەر دەدات ، ئەوسا مەسەلەکە سەربەرەو ژێرو دەمەونوخون دەکاتەوە : (العقل الكامل) لێی دەقەومێتو یەکی دەکەوێتو دەبێتە (العقل الخامل ! ) هەروەها ( البصر الناقد )یش کوێر دەبێتو دەبێتـە ( البصـر الحاقد ) ! دیارە خۆش‌ویستنە کەش ئاوەژوو دەبێتەوە ، والعیاذ باللّٰه ••!

خۆ ئەگەر ئێمە مانانیش هەر لەسەر شـێرازەی مانـای فەرمایشەکـەی ( پێغەمبەر د•خ ) ، وتمـان : ( ان اللّٰه لایحب البصـر الحاقد عنـد ورود الشبهات ، ولا العقل الخامل عند هجوم الشهوات ) باوەڕ ناکەم هیچ گوناەو سەر پێچی‌یەکی تێدا بێت ، چونکە لەبابەتەکە ناگۆڕێت ••

لەبزوتنەوە ئاینیەکانیشدا تینو تەوژمـی پەیوەندە کۆمەڵایەتیەکانیان چەکێك بوە بۆ ئیسپاتکردنی چاکەی ڕێبازەکەیان ، و بیروباوەڕەکانی ، تەنانەت خۆ بەختکردن لەپێناویدا شتێکی پیرۆز بوەو پلەو دەرجـەیەکی جیاوازو تایبەتیان داوەتی ! چونکە ئەو بیروباوەڕانە کە ناو خەڵـکەوە ، بوە بە وزەیەك ، بەهێزێـکی مادی کەوا خۆ بە قوربان کردنی کۆمەڵگەکەیانو بیرو باوەڕەکانی ، بەلای ئەندامەکانیەوە شتێـکی باشـ بـوەو دەسـت هەموکەسێك نەکەوتوە ، چونکە لایان وابوەو سەلمـاندوویانە ، کە بێ کۆمەڵگە کەیان ژیانیان تاڵە ، ئیتر بێ ئەم ژیانیان بۆچی‌یە ••!؟

لەم‌بارەیەوە گەلێك چیرۆكی ڕاستەقینەی لەخۆ بوردن‌و پرشانازی لەم‌لاو لەولا ، بە درێژایی مێژووی ئادەمیـزاد ڕووی داوە •• ئەوەتـا لەسەرەتای مەسیحێتیدا جۆرێك لە تەسەوف‌و تەركی دنیاكردن ( غنوسـی (Gonosticism) هاتەكایەوە ، ژن‌نەهێنانی هەنـدێ لەكاربەدەسـتە ئاینیەكانیان ، هەروەها شونەكردنی ئەوئافرەتانەیان،كە خۆیان بۆ خزمەتی بیروباوەڕی ئاینەكەیان تەرخان كـردوە نیشانەیـەكی ئاشـكرای ئـەم ( غنوسی )یەتەو لە خۆبوردنەیە ••! خۆ لە سەرەتای ئیسلامیەتدا لـە ڕەوكردنی موسڵمانەكاندا لە ( مكە )وە بۆ ( مدینە = یثـرب ) گەلێـك چیرۆكی ڕاستەقینەی لە خۆ بوردن‌و مەردایەتی لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە لە پێناوی كۆمەڵـگەكەیاندا ڕووی داوە ، چونكە ئەم دڵبەندی‌و شەیدایی ، و سۆزە دەبێتە بڕوا (Principle) و بـاوەڕ (Dostrine) ئنجا دەبێتـە هاندەر وەیا (Mohivation) و هۆیەك بۆمانەوەو سەركەوتنـی بزوتنەوە كە ، ئیتر لە خۆ بوردن (Altruism) و خۆبـە كوشـتـدان لـە پێنـاوی بیروباوەڕێـكی كۆمەڵایەتیدا ، وە یا لە پێناوی ( چین‌و نەتەوە ، و هۆزو خێزان‌و هاوڕێیە )تیشدا ، لـە پێناوی شتێـكی بەبایەخ ، وەیا پڕو پوچ ، بهێنێت وەیا نەهێنێت •• هتد ئەمانە تێـكڕا نمونەیەكی ڕاستە قینەو ئاشكران بۆ ئەو سۆزو شـەیداییە •• ! ئیتر ناحـەزانیش چۆنیـسـان بۆ لوابێت بۆ بەرژەوەندی خۆیان ، وایان لەقەڵەم داوەو لێك‌داوەتەوە ••!

بێ‌گومان ئەو بەرەڵاییەی كە دەدرایە پاڵ ( هەقە )كان لەبابەت تەگەوبەرانیەوە (Promiscuity) لەوەوەیە ، كە ئافرەتی ( هەقە )كان سەربەست‌تر بون لە ئافرەتی كۆمەڵـگە فراوانەكەی ، كەتیایدا دەژیان ، سنوری كۆمەڵایەتی ئەمان لەهی ئەوان تۆزێك پان‌و بەرین‌تر بو ، هەندێ باج كەلە كۆمەڵگە فراوانەكەدا بەسەر ئافرەتەوە هەبو لە چارەنوس‌و شو كردنیدا ، ( هەقە )كان نەیان‌دەسەلماندو دانیان پێدانەدەنا •• هەنـدێ

لایەنی تریش کەدەبو بەئاشکرا بەرهەڵستی ئەو باجانەیان بکردایە ، یا لە بەهێزترین باوەریشدا نەبێت بەڵکو لە لەلاوازترین بڕوادا ( أضعف الأیمان ) بوایە ، یاری هیچ نەبێ نەیان سەلماندایە •• ! کەچی چاویان لێدەپۆشیو لێی بێدەنگ دەبون •• کە بێدەنگی نیشانەی ڕەزامەندیە ، دوور نییە کەبە جۆرێکی‌تر پشکێکی ( کۆتا Kotto ) خۆیانی تێدا نەبێت ! ئەم باجانەش وەکو ( شیربایی Dowrysystem ) وسورانە ••! دیارە نەسەلماندنی ئەم دوو نەریتەی لەمەڕ کۆمەڵگە فراوانەکە ، لەلایەن (هەقە)کانەوە ، سەرەڕای ئەوەی کەیاخی بونو سەرپێچی‌یە لەو دوو نەریتە ، هەڕەشەیەکیشە لەبەشێك لەو کۆمەڵە بیروباوەڕەی ( ئایدیۆلۆجیا) کە کۆمەڵگەکەی سەرومڕ بێ‌گۆش‌کراوەو بڕوای پێیەتی ••! جگە لەمەش زیانیەکیش دەگەیەنێت بە گیرفانی ئەوانەی کە سودمەندن لەم دوونەریتە کە ڕاستەوخۆ دەرەبەگەکانە •••، لێرەدا باسی سورانە ناکەم ، چونکە ناوی بەخۆیەوەیەتی دوورنییە کە باجێکی کاشی (نقد)مافێکی زاوایەتی نەبوبێت کە بەپارەوە یا بە شتومەك شکاوەتەوە ، بۆ بەرژەوەندی زاوای ڕاستەقینە ••! بەلام شیربایی ، ئەم دەستورو نەریتە تا قۆلآلآیە کە ئەوسا باوبو ـ گەرچی ئیستایش بە گەلێك شێوازو ناوەوە هەرماوە •• هتد شیربایی بەپێی مانای و شەکە دەتوانین بلێین : ( نرخی‌شیرە ) ئیتر ئەو زژێمە کۆمەلآیەتیەی کە ئەم چەشنە دابودەستورە فەرز دەکاتو دەچەسپێنێت کە ( شیرە خۆری ) هەشت، نۆمانگ لە شیری بەری دایك بە ڕۆڵە ( مێ )ینەکەی بفرۆشێتەوەو پارە بکات ! ئاخۆ ئەو کۆمەڵگەیە دەبێت بە چ بەندایەتیەك مەلآشووی هەڵدرابێتەوە ••!؟ وبەچ چاوێك سەیری ئافرەت بکات کەوا (دایك ، و کچ، و خوشك، و پور و، ژنی••) نێرینەکانیانن ، وە ئەوی دەستی فەوتان بۆ ئەم نەریتە درێژ کات ، وەیا نەی سەلمێنێت ، دەبێ چۆن گەمارۆ بدرێت ••!؟ بەلآم (هەقە )کان بەلای ئەم شیر فرۆشیەدا نەچونو لایان گلآو بوە ••!



خانەقا تازەکەی شەدەڵە
لە ساڵی ١٩٦٨دا دروستکراوە

لێرەدا جێی ئەوە نی‌یە کەلەسەر کێشەی ئافرەت ئەوەندە بڕۆم بەتایبەتی لەناو کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوی وەکو هی خۆماندا ، هەروەها مەبەسم ئەوەنی‌یە ، کە یەخەی بایەخەکانی کۆمەڵگەکەمان بگرمو بەگژیدا بچم .. بەڵکو دەڵێم دەستکاری‌و شێواندن‌و ئاوەژوو کردنەوەی بایەخەکانی ناو کۆمەڵگەو ، کردنی بە خێرو بێر بۆ کەمایەتیەکی زۆرکەم ، کە بونەتە ئەسپێی کراس کۆت بەشان‌و ملی کۆمەڵگەوەن‌و خوێنی دەمژن‌و بە ( های‌لایف )ی لەسەری دەژین ! بێ ئەوەی تنۆکێك ئارەق بکەوێتە ناوچەوانیان .. هتد کەچی زوربەی زۆری کۆمەڵگەکەش کوێرەوەری بۆ بمێنێتەوە هەمیشە دوودەست بەناڵەبێت .. و لە مەینەتی ژیان‌و گوزەراندا تەپاو تلی‌بێت‌و بگەوزێت .. ئەمەیان جنێوو یەگژدا چونی هەمو کۆمەڵگەو بایەخەکانێتی ، سوکایەتی‌و نەفرەتێکیشەلە هەموشتێکی پیرۆزو موقەدەسی .! بەلام ئەوەندە هەیە : هەر یا سایەك‌و پەیرەوێك کە بۆ ئافرەت دادەنرێت ، کەوا سنورێکی ڕاستەقینە نەك بەڕواڵەت بۆ کەساسی‌و کوڵۆلیە مێژوویەکەی لەمەڕ ئەم دانێت‌و یەکێتی شەخسیەتی (Personal Indentity) ـەکەی بپارێزێت‌و پچڕپچڕی ( مونتاج )نەکات هەر تەنها بەشێك‌و لایەنێکی دەرخات‌و بیکات بەبوو کەشەشەو ( تەتە !) سفەتەکانی تری ئادەمیزادانەیی تێدا ون‌کات ، وەیا بیکات بەکەل‌و پەلێکی ڕوو بازاڕی ، تا ببێتە نێچیرێکی قەڵەو بۆ ئارەزوویەکی‌تایبەتی‌و هیچی‌تر ..! ئەو یاسایە بۆ ئەو ئادەمیزادە بێت کەلە ڕووی تەشبی‌هەوە ناوەکەشی لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بوە بە ئاوەڵ‌و مورادیفی ناوی ولاغێکی باری‌و سواری ..! هەرچەندە لەو باوەڕەدام کەبە گوڵێکیش بەهار نایە ..! بەلام ئەم جۆرە یاسایە لەڕووی بەربەرەکانی‌و دوژمنایەتی کردنی کۆنەپەرستێتیەوە ، لەبابەت پێشکەوتنخوازی‌و پێشکەوتبازیەوە گەلێك گرنگترو ئازایەتی‌ترە لە خۆماڵی

( التأميم ) کردنی سامانێـکی نەتەوایەتی چونکە ئەمە تێرێـکی گوشندەیـە کە ئاڕاستەی کولۆلیە دێرینەکە دەکرێت کە ساڵە های ساڵە بەپیرۆزو موقەدەس (Taboo) دراوەتـە قەڵەم ، وەکو گـایەکیشمە کەوا هـەموو بەندایەتیـــەکی کۆنو نوێی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسی لەمــــەڕ کۆمەڵگەی سەرجەم تێدا کۆبۆتەوە ، جگە لەمەش نیوەی کۆمەڵـگەو بـگرە زیاتریشی کـە ئافرەتنو خـزمو خوێشی نێرینەکانیاننو گوایا شەرەفو ناموسیانن دێنێتە ریزی ئادەمیزادەوە ..

## ( ٥ )

لەبابەت ئافرەتەوە ( هەقە )کان هیچ نەریتو پەیڕەوێکی ئەوتۆیان نەبوە کە تایبەتی بێت بەخۆیانو لە کۆمەڵگەکەی کە تیایدا دەژین جیایان کاتەوە (Deviance) بێ پرسی ( مەلا )و بێ ئاگاداری ئەم هیچ پیاوێك نەبوە بە مێردی هیچ ژنێك ، وە هیچ ئافرەتێکیش نەبوە بە ژنی هیچ پیاوێك تا هەردوولا لەبەر چاوی ( مەلا )و دوو شایەت خۆیان (تقلید مذهبی امامی شافعی) نەکردبێت نەبون بە ژنو مێرد..خۆ ئەگەر حاڵەتێك ڕووی دابێت ، ڕەوشتێکی گشتی ئاڕاستە کراو ، ( موجه Conduct) نەبوە لەناویاندا کەوا لە مەرکەزیەتێکەوە هاتبێت ..! بەڵکو بریتی بوە لە پیلانو دەسیسە بۆ ناو زڕاندنو بەدناو کردنیان وەکو لە دواییدا باسی دەکەین ، وەیا کردەوەیەکی ئاسایی ( عادتی )بوە هەروەکو چۆن لەناو هەمو کۆمەڵگەیەکدا بەدزیو بەقاچاغی هەیە ..! لەم ڕووەوە دەتوانم بڵێم سەبارەت بەوەی کە ( هەقە )کان سنورو ئاسۆی ڕوانینیان بەرامبەر بە ئافرەت فراوانتر بو لەچاو هینی کۆمەڵگەیانو بەرینەکەی کەلە ناویدا دەژیان لەبەر ئەمە نێرومێیان،بەلای پەیواندایەتی ( قاچاغ )دا نەدەچون ، لە کاروباری تایبەتی هەردوولایاندا ..! لەم ڕووەوە ( هەقە )کان زۆر داوێن پاکترن لەو کۆڕو کۆمەڵە تێرخۆر و

تێرشۆرەی ، کەلە هیچیان کەم‌نی‌یە ، تەنها بۆ ڕابواردن‌و فیز !! خوو دەدەنە ئەم ڕاووشکارەو شانازی پێوەدەکەن •• ئنجا لەبەر ئەوەی کە لەڕووی ( بون‌ودارا )یەوە کۆکن هەرئەم ( بون‌ودارا )یە بۆ جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکەیان ، سنورو پەرژین دادەنێت ، بەچاك یان بەخراپ چۆن بۆ بەرژەوەندی ئەم جیاوازیە باش بێت‌و بلوێت بەو جۆرە بڕیاری هەستی ئادەمیزادا نەیان‌دەدات‌و دای‌دەڕێژێت ••! کەلە ئەنجامدا ئەم ( جیاوازی‌بازیە )یان هەمیشە دەبێتە کۆسپ لەڕێبازی خواستی مرۆڤایەتیانداو خەفەی دەکات بەتایبەتی لە پەیوەندایەتی‌و چارەنوسی نێرومێ‌یاندا ••! ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە ئەم ( بون‌ودارایییە ) تایبەتیە ، دەسەڵات‌و توانایەکی تایبەتیشیان دەداتێ کەبە زەبری ئەم بتوانن بەئاسانی بەخواستی خەفە کراویان شادبن‌و بی‌گەشێننەوە !! ئیتر لەم ڕووەوە ئازادیەکەیان دەگاتە پلەی بەرەڵایی‌و بەلەسەیی ••! بۆیە ئەم (قاچاغ) چێ‌تیە لەناویاندا پەرە دەسێنێت‌و گەشە دەکات ••! تەنانەت کەسانی‌تری کۆمەڵگە کەش ، چاو لەمان دەکەن‌و لاسایی ئەمان دەکەنەوە ، لەمانەوە فێری ئەم پیشەیە دەبن •• هەروەکو چۆن لەبازاڕی بازرگانی‌و ئابوریدا لەپێشەوەن لەبازاڕی ئەم ( قاچاغ ) چێ‌تیەشدا سەردەق بۆ خەڵکی‌تر دەشکێنن‌و دەبنە پێشەواو ، پێشەنگ و گەورەی ماڵێ ••!!

لەناو ( هەقە )کاندا کەم کەس هەبوە دوو ژن وەیا سێ‌ژنی هەبوبێت ، تەنانەت خوالێ‌خۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، لەژیانیدا تەنیا ژنێکی هەبوە ، بۆیە ناوی ئەم زاتەم هێنا ، چونکە پیری گەورەیان‌بوە ، کوردواتەنی گەورە ئاو دەڕێژێت بچوك پێی لێ دەخات ••، واتە لاسایی دەکاتەوە ، کەچی پیری ڕێبازەکانی‌تر کە وەکو ( هەقە )یەتی لەیەك سەرچاوەی فەلسەفیەوە پەیدابون ، یەیەك دوو ژنەوە

دانەکوتون ••! بۆ سێیەم‌و چوارەم مرخیان لەکارەکەرو کەنیزەك خۆش کردوە ! ئنجا کە کار لە کارترازاو ! هاتون بەسوکە نیکاحێك ئاوی دەستنوێژیان حەلاڵ کردوە ، دەڵێم بەسوکە نیکاحێك چونکە بەچاوێکی سوك سەیر کراوە ••! جگە لەمەش بەگەلێك وەسیلەو شێواز ، پاشقول لەمافی ( شەرعی‌و قانونی ) گیراوە تامافندی کراوە •!! تەنانەت منداڵەکەی لە ڕووی هەستی مرۆڤایەتی‌و عاتیفەوە ، بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە ••! ئنجا لەڕووی ( سێکۆلۆجیا )وە ئەگەر بەقاچاغی‌و بێدەنگ ، هی تریش هەڵکەوتبێت ، هەبوە فووی لە دۆ نەکردوە و بستی بەقەرز نەراوە ••!

ناسیاوێکم خوالێخۆش بێت ، گێڕایەوە وتی : فەڕاشێکیان هەبوە ڕێبواری ڕێبازێك بوە لەو ڕێبازانە ، حەز لەئافرەتێك دەکات نانکەری ماڵی ( پیرە )کەی هەردوکیانە ••! لەسەر تەندوور توشی ئافرەتەکە دەبێت ، گڕی تەندوور ، کوڵمی سور کردۆتەوە زیاتر گڕی بەرداوەتە گیانی ئەم ••! کابرا بەرامبەری دەوەستێ‌و قەڵەمی ئەژنۆی دەشکێت ••، ئافرەتەکە پێی دەڵێت : بۆچی بەدیارمەوە چەقیویت ••؟؟ کابرا گرێی دڵی خۆیی بۆ دەکاتەوەو •• هتد ئافرەتەکەش لە وەڵامدا دەڵێت : گەوجە سەرەڕای شێخە بچکۆلەکان ، ( شێخی ) گەورەشس سێ‌مانگی ڕەبەقە لەگەڵمدا خەریکەو ، بەتەمایە ••• هێشتا گفتم نەداوەتێ ••! ئێستا تۆ بەکفلەکونێك ( کن‌فیکون ) دەتەوێ دەست گیرت‌بم‌و بە ئاواتی خۆت بگەیت••!؟لەمەدا مەبەسم تاوانبارکردنی کەس نی‌یە بەڵکو لەڕووی بەراوردو ڕونکردنەوە پەروەردەوە دەڵێم ، لەکاتێکدا کە مرۆڤ بەبێ ڕتوش‌و مرك لەخۆنان ، بە خۆی‌و بیروباوەڕەکەیەوە کەوا پێی دەنازێ ولافی لێدەدات ، لەگەڵ پێداویستی ژیان‌و خواست‌و ئارەزویدا بێ چرپەو بێدەنگ !! بەرەوڕوو دەبنەوە ••

تا لەم بوارەدا درۆو ڕاستی خۆی لە ( مەسەلە )کەیدا دەردەکەوێت ...،
واتە ئەو مرۆڤە خۆی لەخۆیدا ـ یەعنی بەش بەحاڵی خۆی ـ چەند گۆڕاوە ، تا لەگەڵ مەسەلەکەیدا بگونجێت ، ئەو مەسەلەیەی کە دەوێت خەڵکی تری پێ بگۆڕێت و بیانهێنێتەریزی ڕێبازەکەی خۆیەوە ..!

لەڕێڕەوی ئەمباسەدا گەلێك پرسیار دێتە پێشەوە ، گرنگەکەیان :
بۆچی ئەم قسەو بوختانانە بۆ ( هەقە )کان بەگشتی دەکرا کەچی مریدو مەنسوبو مەحسوبواتە : ( ئەندام ، و پاڵپوراو ، و جەماوەری ) ! ڕێبازە کلاسیکیەکانی تر ( پیاوچاك )بنو لەخەڵکی بنە پەپولەو فریشتە ..!؟
لەکاتێکدا ( شێخوپیری )هەقەکانو سەرکردەکانیان بەسەنگو تەلازووی ئاینو ڕەوشتو کردەوە ، ئەگەر لەشێخوپیرو سەرکردەی ڕێبازەکانی تر قورستر نەبوبن ، سوكتر نەبون ..!؟

بێگومان ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەمو تەنگوچەڵەمە کۆمەڵایەتیە کە کۆمەڵگەی خستبوە سەغڵەتیەوە .. ( هەقە )کانیش هاتن چارەسەری ئەو تەنگو چەڵەمانەیان ـ گەرچی بە جۆرێکی ساکاریش بێت ..، ( هەمان سەرچاوە ـ ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە ـ مصطفی عسکری) ئاوێتەی بەرنامەی سۆفیگەریەکەی خۆیانیان کردبو کەوا ڕێبازەکانی تری مونافیسیان کەمو زۆر خۆیان لەقەرەی نەدەداو توخونی نەدەکەوتن ..!
لەبەر ئەمە بو کە پیرو شێخی ئەو ڕێبازانە تینیان بۆ هاتبو ، ترسیان لێ نیشتبو ، کە ئەگەر تەسەوفی ئەم بەرەیە واتە ( هەقە ) ببێتە هۆیەك ، وەیا نمونەیەك کە سەرومڕ ( تەسەوف ) بەو ڕێگەیەدا بڕوات .. مریدو مەنسوبو مەحسوبەکانی ئەمانیش یەعنی ( جەماوەرە ) کەیان .. ئەگەر نەڵێم هەمویان بەڵکو زوربەی زۆریان نەداراو هەژارن ، لەتاو باشە لەقەی هەژاری هانایان بۆ ئەمان هێناوە کەلەو کوێرەوەریو ئاتاجییەی کەوا

تیایدا دەژین و دەتلێنەوە فریایان کەون و سەبوریەکیان بدەنـەوەو دڵیـان خۆش کەن ..! ئەو جەماوەرەیان بۆ دابین ناکرێت ..، لێ یان دەکەونـە پرتەو بۆڵە ! کە ئەنجامەکەی بە داخوازی و داواکاری دەشکێتەوە لەمان و لێ یان دەبنە برابەش ..! کە ئەم بارەیان بۆ ئەوان دەست نادات .. چونکە خەڵـکەکەی سەربەخۆیانیان ، وەیا جەماوەرەکەیانیان بەتەســـەوفێـکی وشکی و ڕووتی ڕاهێناوە ، کە دروست نی یە شـتی تری تێکـەڵ بکرێت ، بۆیە ، ( تەسەوفە )کە ، دەیان سرەوانده سۆفێتی و ڕێرەوی ( هەقە )کان ، کەگوایا فریان بەئاین و ( تەسەوفە )وە نی یە ! کەچی هەر بەوتەسەوفـەو ڕێرەوی خوێشیان بەخشکەیی و بێ دەنگ ژیانێـکی ئاسوودەو جنجیلانەی ( دنیا )یان بۆخۆیان مسۆگەر کردبو ..! چونکە دەیان زانی ، کە ئەگەر بای ( تەسەوف ) لەم کونەوە بێت ، یەعنی گیر گرفتی ئابوری و کۆمەڵایەتی جەماوەرەکەیانی تێـکەڵ بکرێت ئەمانیش دەبێ ببنە برا ( هەقە )یەك ، و لەمڕووەوە دەبێ لەدنیای ڕووندا پێشبرکێ یان ( المسابقه )لەگەڵدا بکەن ، کەلە پێشدا خۆیان ، دەدۆڕێنن ..!چونکە ئەو ژیان و گوزەرانەی کەلـە سایەی ئەمپیشەیەوە هەیانە ، کەوا لەتەڕ دەخۆن و لەوشـك دەنـوون !! دەکەوێتە مەترسیەوەو نان بڕاو دەبن ، ئەوسا دەبێت بەڕەزامەندی خۆیان دەست بەرداری مەسەلەکەیان بین و ئاش بەتاڵی لێ بکەن و بڵاوەو پای دۆس بە جەماوەرەکەیان ( مریدو مەنسوب و مەحسوب ) کە ئەمەش مەحاڵـەو کاری کردە نی یە ، بۆیە لە ( هەقە ) دەسڵەمینەوە ..!

ئەمـــە لەلایەك لەلایەکی تریشـــەوە پیروشێخانی ( هـــــەقە ) لـەژیانی خـۆیاندا هـــەر وەکو مریدێـــــکی خۆیان ژیـــــاون ( لاپـــەڕە « ٥١ » پاشـــکۆ ٥٦ ئاوڕدانەوەیـەك لەبزوتنـــەوەی هەقـــــە ـ مصطفی عســــــکری ) هیـــچ جیـاوازیەکی ئەوتۆیان نەبوە کەپەنجەی بۆ ڕاکێشـرێت ، کە ئـەم لایەنـە ، بـەلای دەســتوپێوەندو

جەماوەرەوە زۆر گرنگەو بایەخێکی تایبەتی هەیە ، چونکە نیشانەی گیانی تەبایی‌و یەکسانی‌و خۆ جیانەکردنەوەو خۆبەزل نەگرتنە ، دە بۆ بەمریدو مەنسوب‌و مەحسوب ( جەماوەرەکەیان ) بەجان‌و جگەر دەیان‌پاراستن•• بۆ نمونە : جارێکیان خوالێ خوشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە دانێکی دێشێت‌و دەی کێشێت ، مریدێکی کەئەمە دەزانێت ، دێت هەر سی‌ودوودانەی خۆی هەڵدەکێشێت ! ئەم ڕەوشتە بەئازارە نیشانەیەکی ئاشکرای دڵسۆزی‌و خۆشەویستی‌یە •• دیسانەوە کە خوالێ‌خۆشبو « شیخ عبدالکریم »ی شەدەڵە دەگیرێت ، هەموتێکڕا لەحاڵەتی تەبیعی دەردەچن ، و جلی گونیە لەبەردەکەن‌و شێت‌و وێت دەبن لاپەرە (٢٥) هەروەکو دەربڕینی بێزاریەك بەلام بەجۆرێکی ناڕێك •• ئەمەش لەئەنجامی گوێ‌نەدانە هاوارو سکالایان‌و لەداخی هەلویستێکی نەگریس‌ونا قۆلاو ( پیلان )کەوا بەرامبەریان کەوتبوە گەڕو لەژێرەوە بۆیان ساز دەکرا ، کەبە گرتنی خوالێ‌خۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە دەستی پێ کرد ••! ئیتر کردەوەکانیان لەو هەنگامەدا لەڕووی سایکۆلۆجیەوە بریتی‌بو لە دیمەنێکی پیش خواردنەوەو ، وڕك گرتن ،و تۆران ، و مان گرتن‌و یەخەدادڕین‌و خۆخواردنەوە ••• هتدهەروەك کردارێکی بەرپەرچدانەوە ( رد الفعل Reaction ) بەلام بەشێوەیەکی ( سلبی Negativism ) • چاکترین بەڵگە بۆ دڵسۆزی‌و خۆبەخت‌کردنی جەماوەرەکەیان لەپێناوی پیرو شێخەکەیاندا ، دورخستنەوەکەی ، خوالێ‌خۆشبو ( مامەڕەزا )یە بۆ عەمارەو بێزاری دەربڕینی ( هەقە )کان‌و ڕەوکردنەکەیانە بەپۆل بۆ ( یاروەلی ) لە کرکوك کە ژمارەیان دەگەیشتە دە وەیا دوانزە هەزارکەس لەقەبزی پایزدا بە ( خاوو خێزانە )وە ، بێ ئەوەی گوێ بدەنە سەرماو سامان ••• هتد ئەم بزوتنەوە جەماوەریە ، جەماوەر هاتنە مەیدانەوەوە ، بەڵگەیەکە،

کەوا ( شێخ‌و پیرو مریدو مەنسوب‌و مەحسوب )کانی ( هەقە )لەمەسەلە کۆمەڵایەتیە ئابوریەکەدا پێکەوە کوڵان بون‌و جۆشیان خواردبو ، لەیەك جیانەدەکرانەوە ( لاپەرە «٣٧» کێشەی تەسویەی دێی گەڵنێری‌و مامەڕەزا ـ هەمان‌سەرچاوە ) •• ئەگینە لەو باوەڕەدا نیم کە پیرو شێخی ڕێبازەکانی‌تر ، لە لێ‌قەومانیاندا مریدو مەنسوب‌و مەحسوب‌و دەستوپێوەندەکانیان ئەوەندە بەەرۆش بن بۆیان‌و بەتەنگیانەوەبن ، کە تێکڕا بەیەك دەنگ بەو جۆرە ڕاپەڕن‌و بەرگریان لێ‌بکەن‌و لەپێناویاندا بێنە مەیدانەوە ••! مەگەر لەسەرەمەرگدا دوربەدور ئەگەر ( فاتحة )یەکی ناڕەوانیان پێ ڕەوا ببینن‌و ئەمان بەخێری خۆیان بۆیان بپاڕێنەوە کە خوا لەگوناهی نەهێنی‌و ئاشکراو کۆن‌و نوێیان خۆش‌بێت ! ئەمیش بە مەرجێك کەمەینەتی‌و کوێرەوەری بەکۆستێکی‌دا نەخستبن کە ( شێخ )ی هەر لەبیر بردبنەوە ••!

ئیتر ئەوانە تێکڕا هەمویان ئاگر بڕکەوتنە خۆیان‌و بوختان‌کردن بە ( هەقە )کان کێچێکی‌ن لێ‌دەکردن بەگایەك‌و گوێزێك بەگومەزێك ••! لەم هەڵویستە ناشیرینەدا گەلێك کۆڕو کۆمەڵی‌تر لەکەلەپوری وێژەی سوکایەتی‌و جنێوی خۆیان دژبە (هەقە)کان باربوویان دەکردن‌و دەستیان تێکەڵاو کردبو ـ چونکە ئەوانیش لەم گۆڕستانەدا مردوویەکیان هەبو ، بەتایبەتی لەکپ‌کردن‌و خەفەکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان‌و دیزە بە دەرخۆنەکردنیاندا ـ چونکە ئاوێتە کردنی کێشەی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری بەم ڕێبازانە زیان دەگەیەنێت بە بەرژەوەندیان •• بە کورتی حەز دەکەن هەمیشە خەڵکی لەگوێی گادا نوستبێت ••! ئنجا ئەوی دەنکە جۆیەکی ماڵی پادشای خواردبو ، واتە ئەوی لەگۆشەگیری‌و دورەپەرێزی ئەوڕێبازانە لەکێشەی کۆمەڵایەتی‌وتەرخان‌و تاپۆ کردنی لەسەر بەرەیەکی تایبەتی دەمیان چەورو نانیان لێ‌خواردبو لە ( هەقە ) کەوتنە تەقە ! چونکە

ئاقمێك ، بەرەیەك ، هەر چۆنێك بێت دەستگیر دەبێت‌و كاری تێ دەكرێت، بەڵام خەڵـكەكە ، قەڵەباڵغیەكە ، جەماوەرەكە، هەتا هەتایە ، تەفرەدان‌و فریودانی ئاسان نی‌یە ••!

ئەم كەین‌و بەینە لەناو كۆڕو كۆمەڵـە سیاسیەكانیشـدا ڕوو دەدات چونكە بنەرەتی هەمو مەسـەلەیەك ، بەهـەمو بارێـك ( جەماوەرەكـەیە ) كەبۆ چەوساندنەوە دادۆشین مەڕی دۆشەنی ، لە تەنـگانەو مەینە تیشدا قۆچی قوربانی ، لە پێناو ورێڕەوی ئازادیشـــدا مەردی مەیدانە !! بـە كورتی خۆی مێژووەو مێژوویش خۆیەتی ••!

بەم بۆنەیەوە نەهێنی‌یەك ئاشكرا ناكەم كە بڵێم : ئەگەر ناكۆكی‌ناو كۆمەڵـگەیەك پەرەی سەندوگەیشتە ڕادەی ترس لە شێواندن‌و فەوتاندنی ئەو بایەخ ( القیم )و باوەڕانەی كەلە كۆمەڵـگەكـەدا حوكـوم فەرمـان ( الافكار السائدة ) • ژمارەی بوختان درۆو جنێو دوو ئەوەندە ( مربع )وەیا سێ ئەوەندە ( مكعب ) بگرە زیاتر ، لە ( حجم )و قەبارەی ئەو شتەی كە مەترسیەكەی لێ دەوەشێتەوە زیاد دەكات•• خۆ ئەگەر لەگەڵ سەردەم‌و زەمـان ، لێـكی یدەین ، وەیـا لێـكی‌بدەینـەوە ، ژمـارەی درۆو سوكایەتی لای بەپەرۆشانی بایەخ‌و باوەڕە حوكوم فەرماكـەی ، كـــە كەوتۆتە مەترسیەوە بەرامبەر بە ناحەزەكانیـان ، دەگاتـە ژمارەیەكـی (فەلەكی) ! تا ئەو بە پەرۆشانە یەك پارچە دەبنە تۆپەڵێك ( كتلة )لـــە وزەی درۆو دەلەسە ، وەیا دەبنە فەیلەسـوف‌و داهێنـەر ( المختـرع ) و هونەرمەند ، لەو وێژەی سوكایەتی‌و جنێودا •• ! تەنانەت لەخۆیشیان دەخۆن‌و لە یەكتری دەكەونە تەقە ، وەك لەشكرێـكی پەشۆكاو ، دوژمن زۆری بۆ هێنابێت‌و لە مەرگانی نزیك كردبێتەوە •• ئەمە ئەگەر بمانەوێت بابەتەكە ، بە زاراوەی ڕەوانی ماتماتیك ( الریاضیات ) بەراورد كەین‌و

دەبڕین ••! وڕوون کەینەوە •

بەڵام بەسەنگ‌و تەرازوی کۆمەڵایەتی ( الاجتماع )دەڵێین - ئەوانی کەلە ئەنجامی ئەم ناکۆکی‌و بەزم‌و ڕەزمەدا ئیشەکانیان لێ تێك‌دەچێت‌و لێیان دەقەومێت‌و مەترسیەکە ئاو قای دەسەڵات‌و بەرژەوەندیان دەبێت لەناو کۆمەڵگەدا ! دێن سەنگ لەخەڵکی دەگۆڕن، تەنانەت دەستە چەورەکەی خۆیان بەسەر هی‌تردا دەسون‌و خۆیان بەوان‌و بە ناحەزانیان پاك دەکەنەوە ••! ئیتر هیچ بە لایانەوە ( شەرم‌و خەوش )! نی‌یە کە ڕۆژی صەدجار سەر پێچی لەو بڕیەخانە بکەن ، کە کردویانە بەبنێشتە خۆشەی ژێر دانیان‌و کوتەکی دەستیان ••، ئیتر چۆنیان بۆ بلوێت بە ئارەزووی خۆیان مل لەو : ( حرام‌و حلال ، وەیا ممنوع‌و مسموح ، وەیا قانونی وبێ قانونی‌یە )بە کورتی لەو « دەبێ‌و نابێ‌یە » وەردەگێڕن ، بێ ئەوەی هیچ باکیان بێت ••! وەیا مێشێکیان میوان بێت ••!

## ( ٦ )

له بیرمه ئەو سا له سەرگەڵودا دووسێ کانی تێدابو •• کانیژنان لەولاتی ئێمەدا له هەموڕوویەکـەوه شوێنێـکی دیـاردیو جیـاوازی هەیه •• سەرەڕای ئەوەی کەوەکو گۆران دەڵێت : ( قیبلەی دڵـداری هەرزەکارانه ) •• مەڵبەندێـکی تایبەتی ئافرەتانه که به سەربەستی سکالاو گلەیی بەختی خۆیانی تێدادەکەن •• هەواڵ دێ ماڵ بـەماڵ تێدا باسـ دەکرێت •• به کورتـی نیمچـه دەزگایەکـی سوکەڵـەی ڕامیاریـه بەشێوەیەکی ساده ، کەوا هەموها مشۆکەرانی و ئەندامانی ئافرەتن ••

دوای نوێژی خەوتنان ، ئافرەتودەسته کچ کۆڕێکی هەڵپەرکێیان ساز دەکرد به ( شیخ ) یاندا هەڵدەگوت به ئاوازێك ( ترنیمه Them ) کەلەناخی دەرونیانەوه دەهاته دەرەوه ، دووپاتیان دەکردەوەو دەیانوت : ( هیمەی ناکەم هیمەی بەدرۆ )! کەئەمه وادەگەیەنێت که زۆر دوژمنی درۆ بون ، ئەو نەخۆشیه کۆمەلایەتی ـ سایکۆلۆجیەی کەله ئەنجامـی هەستکردن به ناتەواوی (Inferiority-Complex) پەیدا دەبێت ، که بەلای ، نه خۆشەکەوه ، وەیا « درۆزنـەوه » ، وایه کـه هەمو خوارو خێچیەکی پێڕاست دەکاتەوەو لەوانەیه بیگەیەنێته ئاواتەکەی خۆی ••! ولێفەیەکیشه هەمو خەوشو کەمو کوڕیو ناتەواویەك دادەپۆشێت ••!

ئنجا دوای ئەوەی کە ئەم کۆڕە تەواو ماندو دەبون ، دەستیان هەڵدەگرت
و چەند کەسێکیان ( حاڵ = جەزبە Ecstasy) دەی گرت ، ئـەم
حاڵەتەش وەنەبێت تەنهـا لەناو ئەمانـدا ڕوو بـداتو بەسـەر ئەمانـدا
هاتبێت ..، بەڵـکو لەکۆڕی ( ذکر )دا بە تەپڵ و دەف ، کە دوو ئامیری
موسیقین ئەم حاڵ لێ‌هاتن‌و هیسـتریایە (Hysteria) ڕوو دەدات
بەتایبەتی کە کۆڕەکە تەواو گەرم دەبێت‌و دەگاتە پلەی (ذکری‌هەڕە)..!
هەروەها لەناو کۆڕو کۆمەڵی هونەریشدا کە بزوتنەوە (Movement)
و هەڵپەرکێ بە ئاوازی موسیقاوە بێت هەمان دەستور جەزبە ، هیستریا ،
حاڵ‌و فـێ لێ‌هـاتن ڕوو دەدات. بە تایبەتـی لـە هەڵپەرکـێی ( ڕۆك
ئەندۆڵ )دا ، بە ئاوازی مۆسیقای ( گاز )ەوە ..! خۆ لە ناو میللەتەکانی
ئەفەریقادا ، لەئاهەنگ‌و بەزمی خۆیاندا ئەم حاڵ لێ‌هاتن‌و جەزبە گرتنە
شتێـکی تەواو ئاساییو عادەتیە ، هەروەها لە وڵاتەکانی ئەوروپادا لـە
یانەکانی شەوگاریاندا (Neight-Clubs) کە بەدیمەنێکی پێشکەوتن
یان دادەنرێت ..! لە لنگەفرتێی هیستیریاو جەزبە خراپتری تێدا ڕوو
دەدات ، بە جۆرێـك هەمـو کردارێـکی فسیۆلۆجـیو بایۆلۆجی کە
پەیوەندی بەئادەمیزادو ئادەمیزادێتیەوە هەیە تیایدا سوك‌و ڕسوا دەکرێت
ئەمە سەرەڕای کۆڕو کۆمەڵی‌ترو ( هیپیەکان ) ، کە تێـکڕا دیمەنێکن ،
لە دیمەنەکانی ڕەنجەڕۆییو نامۆیی ئادەمیزاد لەسایەی ڕژیمێـکدا کـە
بەندایەتی چەوساندنەوە پیرۆز ترین بایەخێتی ..! چونکە لەم حاڵەتانەدا
بەشداربوانی ئەم کۆڕانە دەگـــەنە ئەوپـەڕی خۆشی ئنجـا دەسـەڵاتیان
بەسەرخۆیاندا نامێنێت ،.. بین‌و ( لانسـی ) وەر دەگـرن ، لـــەڕست
دەردەچن ..! بەڵێ ( ئەوپەڕی خۆشی ) ئەو خۆشیەی کۆمەڵـگەکەیان‌و
جیهانی واقیعیاندا چێشکەی ناکەن‌و بێ‌بەشن لێی ! ئیتر دێن بەم شێویە ،
تۆڵەی ئـەو ( بێ‌بەشـی )یـە دەکەنەوە ..! بـۆ ماوەیـەك خۆیـان
سەرخۆش‌و دڵخۆش وژێرخۆش دەکەن ..!



خوالیخۆشبو شێخ عبدالكريم-ی شەدەڵە

بزوتنەوەو چالاکی ئافرەت بەشێوەیەکی گشتی بەداخەوە لەوڵاتی ئێمەدا جێی ڕەزامەنی هەندێ کۆڕوکۆمەڵ نی یە ، کەوا لەگەڵ (هەقە)دا لەڕووی فەلسەفیەوە لەبەرە ( بابێکن ) ! تەنانەت کەلەپورێکی نەتەوایەتیمان کە ( ڕەش بەڵەکە ) لەتیرو توانجیان بەدەر نەبوە ..! ئنجا ( هەقە ) یەتیەك واتە ( تەسەوفێك ) ڕێگە بەچالاکی ئافرەت بدات . وە یا هەڵوێستێکی کەمتەرخەمی هەبێت بەرامبەری و تاوانباری قەدەغەی نەکات ..! وەیا سنوری بیروڕایان بەرامبەربە ئافرەت تۆزێك کراوەتربێت لە چاو ئەوبیروڕاو دابو دەستورەی کە کۆمەڵگەکەی سەرجەم پێ ڕاهاتوە وەیا پێ ڕاهێزاوە و پەروەردە کراوە وەکو لەپێشەوە باسکرا .. ئیتر ئەو کۆڕو کۆمەڵانە ( هەقە )کانیان چۆن بەدڵە ؟! سۆفیتیەکەیان چۆن ناکەن بەزڕ ؟ وخۆیشیان بەمنداڵی ژنەدۆمەکە ..!؟ با لەبەرە ( بابێکیش ) بن ..هتد چونکە زۆرانبازی لە پێناوی مانەوەدا Struggle For Existence ڕێ و شوێن و دابو دەستورو یاسای خۆی هەیە هەریەکەو هەرلایەك : گفتارو ڕەفتاری خۆیی پێیە ، ڕەواو نارەوا ، هەق ، و ناهەقی خۆیی هەیە ..!! زۆرانیان پێ دەگرێت سەرەشکێنەیان پێ دەکات .. بە درۆ ، و بەڕاست لەکۆن و لەنوێ بەهانەی مانەوەیی بۆ دێنێتەوە ، تا ئسپاتیان کات و بیان چەسپێنێت .. !!

لەم جۆرە نمونە زۆرە : تەنها بۆ دەرس و پەند باسی دەکەم و هیچی تر ، ئەوانەی کەوا ئاگاداری بزوتنەوەی نیشتمانی بون لەکۆتایی ساڵانی چل داو سەرەتای پەنجادا باش دەزانن کە خوالێخۆشبو مامۆستا ( كامل الجادرجي ) نوێنەرێکی بەڕێزی ڕیزێکی نیشتمانی بو .. ئەم پیاوە هەر ئەوەندە دەمی سوتا ! باسی دیموکراتیەتی دەکرد لەچوارچێوەی ئەو دۆخ و بارەدا کە هەیە ( الوضع القائم Topia ) تا خەڵکی خەم و بەژارەی خۆیان بەبا بدەن و نەی یەچنە دڵ و پەنا نەبەنە ، بەر سەرکێشی و

یاخی بون له میریش که گوایا نیشتمانی بو ، لـێی زویـر نەبـن وە یا بێهیواو پەنجەڕۆبن لێی ، که ئەم دیموکراتیەته سودی ( میری )تێدایەو سودی ئەوانەی که بەتەمای (میرێتین)و بەردەوامی (میریێ)تیەکەیان ..! کەچی ناحەزانو و دوژمنانی دیموکراتیەت له لاپەڕە زەردباوەکانیاندا ، بـە ئاشـکراو به نەهێنی ، ڕوو بـەڕوو وەیـا پاشملـە ، هەرچی ناشێ پێیان کرد ... هتد ، تاکو ڕقو کینـەی خۆیانی تـەواو پێ بڕێژنو کەفوکوڵی دڵیان بنیشێننەوە دەهاتن ناوونـاتۆره لـەو پیـاوە بـە ڕێزه دەنا ..، دەسـتکاری پێناسـو ناوەکەشـیان دەکـرد ، پێیـان دەوت : ( کاملیۆف جادربۆسکی ) ! ئەی ( هەقە )یەتی لەلایەن ناحەزو دوژمنانـی هەندێ ( مافو ڕاستی ، و هەقە )وە دەبێ چی پێ بوترێت ..!؟

تاکو باشتر لەبنەڕەتی مەسەله کۆمەڵایەتیەکان تێبگـەبن پێویسـته کارەساتو ڕووداوە کانی ، سەردەمو زەمانمان لەبیرنه چێت ، گەرچی له کتێبەکەی مامۆستا ( مصطفی عسکری ) دا سوکه دەستنیشـانێك کراوە ( لاپەڕە « ٢٣ » ) ئەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی کەلەمەڵبەنـدی باسکراوەوە نزیکن ..، که تا ڕادەیەك کەمو زۆر ڕاستەو خۆیان لابەلا ، کارلەو بزوتنەوانه دەکەن کـه هاوچـەرخو هـاودەمی ئـەم ڕووداو و کارەساتانەنن ..!

خوا لێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، له ساڵی (١٩٢٠)دا دەستی بە ( ارشـاد ) کردوه ( هەمانسەرچاوە ) ، یەعنی دوای جەنـگی یەکەمی جیهانی ، که جیهان خەڵتانی خوێن بوبـو ، وەهێشـتا کارەساتـه پڕمەینـەتیەکانی لەبیر خەڵـکی نەچـوبوەوە ...، سـەبارەت بەگرانی (Famine) و گرانباری سەفەربە رو پاشه لەقەی جەنگەکە ، گەلێك چیرۆکی ، تراجیدی ، بەسەردەمی خەڵکەوە بو ، ئەوی دیبوی بۆ نەدیوی دەگێرایەوە ..، ئەو کارەساتانه ، تەنانەت دەرونی کوێریشـیان هێنابـوە

جۆشـ ( هەڵبەستەکـەی خوالێخۆشبو مـلا حمـدون بـەناوی سەفەربەرەوە •• ) ، هەر لەم ساڵو سەردەمەداشۆڕشی ساڵی ( ۱۹۲۰ )ی عیراقو لەئینگلیز ڕاپەڕین ، پێش ئەم بەسـێ ساڵ بەرپابونی شۆڕشـی ئۆکتۆبەرو ، دامەزراندنی دەسەڵاتی سۆڤێتو دەسەڵاتی هەژارو نەداراو دەنگدانەوەی بە هەمولایەکدا هاتە ئاراوە •• بۆبە نمونەو پێشرەوێك : کە ئەگەر هەژارو چەوساوان یەك بگرنو ڕیزو ڕێبازی خۆیان بزاننو گومڕا نەبن ••!! دەتوانن‌بڕای ببڕ سنورێك بۆ چەرخی چەپگەردو ستەم دابنێنو پرزەی سەرکردایەتیو پێشەوایەتی چینە جیاوازو موفتە خۆرەکان ببڕن لەناو کۆمەڵـگەکەیانـدا ••! و ژیانێـکی ئاسودە بـۆ خـۆیانو نەوەیان مسۆگەر کەن !! ئیتر مقۆمقۆی ئەم دەسەڵاتە وەك ئاگر لەکای کۆن یەعنی لە ( ستەمو چەوساندنەوەی دێرین ) بەربو بێـت ، کەوتـە ناوەوەو بە هەمولایەکدا تەشەنەی کرد ، کەوا سەرچاوە کەشی ، بەماوەو مەسافە هەر ئەوەندەی ، مەڵبەندی ( هەقە )کانو بەسرە لێیانەوە دورە ••! بۆیە شتێـکی سەیر نییە کەوا هەر بزوتنەوەیەك کـە پەیوەنـدی بـە کۆمەڵانی خەڵـکەوە هەبێت بەهەر ناوێـکەوە بێت بە درۆ یان بەڕاست دەبێت بەشی ئەو هەژارو نەدارایانەی پێوە بێت ، ئەو هەژارو نەدارایانە کە ئەمڕۆ بونەتە ( هەوێن ) لەمەیینو بزڕکان واتە لەسـەرکـەوتنو نوشوستی هەمو کردارێـکی کۆمەڵایەتیو سیاسیدا •• بەکورتی ئەمڕۆ بونەتە ( گۆی گرەو ) ••! بۆیە دەڵێم بە ( درۆ ) چونکە هینی تریش هەیە ، بە مەبەسی لەخشتەبردنو خەڵەتاندن ، و کردنیان بەپردو بەردەباز دەم لە کاروباری هەژارانەوە دەدات •• ، چونکە دەمی کەس بە کەس ناگیرێت ، خۆکوردەواری خۆیشمان و تویانە : ( دەمـە چیت لێکەمە ••؟! ) کـە ئەنجامەکەشی بۆ ئەو چینە نەدارایە لەدەستیدەستی و تەفرەدان زیاتر ، وەیا جاف واتەنیلە : ( خاس دانیشن نانهات ) بەولاوە هیچی تر نییە ••!

## ( ٧ )

ئەو سا لەسەرگـەڵودا جگە لەقوتابخانـەو دایرەی ( اسـتهلاك ) مەخفەرێـكی پۆلیسیشی تێدابو ، وەكو پێشتر و تم لەبەر ئەوە كە خەڵكی ئەم دێیە هێمن‌و لەسەرخۆ بون هیچ ناكۆكیەكی وهـایان نەبـو ، كـــە پێویستیان بە پۆلیس‌و پۆلیسخانە بێت ..، لەم لایەنەوە لەوێ پۆلیس هیچ دەورێـكیان نەبو كەلە خزمەتی ئەوان‌و لە خزمـەتی گەلدا بن ! بەڵام وا دیاربو دەورێـكی تریان پێ سپێررابو لە ناویاندا ..!

لەكاتی و روژانەكەیاندا (Excitation) هەندێـیان وەك ئەوان جلی گونیەیان لەبەر دەكردو دەچونە ناویانەوە...،خۆیان وا پیشان دەدا كە گوایا ( هیمەت‌و بەرەكەتی شیخ )ئەمانیشی ڕاكێشاوەو كەمەكێش ، وەیا ( كەمەندكێش ) كردون .. ئنجا بۆ ئەوەی جێی باوەڕو متمانەی ئەوان بن ، لەو بەزم‌و ڕەزمەدا سرەوتیان نەبو ، لە ( هەقە )كان بە جۆشـترتر بون .. بەزاراوەی سیاسـی لـەوان ( چـەپڕەو )تر بون ... هتـد هەندێكی‌تریان بەرگە ڕەسمیەكانیان دادەكـەندو جلیـان دەگـۆڕی .. سەریان بن‌بانیان لە ئافرەت دەگرت ، چاوبڕكێیان لەگەڵدا دەكردن .. لەپەنای ئەم ئەركەوە كە دیاربو ڕەسمی‌بو ! چونـكە دەبوایـە سـنورو

لێپرسینەوەیەکی هەبوایە •• بەتایبەتی بەنیسبەت کابرایەکی فەرمانبەری میریەوە کە نابێت کارێکی وا بکات ، خۆی لەکەدارو بەخۆیەوە ناوی وەزیفەکەیشی بزڕێنێت • لەپەنای ئەم ئەرکە ڕەسمیەوە ، وەیا بە بەرگە ڕەسمیەکەیشەوە گەلێك شت کە وتنی ئاسانەو ئیسپات کردنی گرانە ••! وەکو چیرۆکێك کە خۆیان کوڕە ئازاو پاڵەوانەکەی بوبن ، و ئەو ئافرەتە بەسەزمانانەش لەمان قۆزترو لاوچاکتریان دەستنەکەوتبێتو تەنها بە تیری عەشقی ئەمان گرفتار بوبن ••! دە ئەوەندەی تریشیان پێوە دەنا ، بەئاشکرا دەیان گێڕایەوەو باسیان دەکرد •• لەسەرەتاوە بە مەبەسی ناوزڕاندیان • لەدواییدا ئاڕاستەکردنیان بۆ سەرئەو ڕێبازەی کە خۆیان مەبەسیانە وەکو ( ڕاسپارد )ەیەك ••! بێ ئەوەی شەرمەزاربن ئەوی کە دەیڵێن ئەمان هاندەرو هاوبەشو لایەنێك بون تیایدا • چونکە هەمو خراپەیەكو تاوانێك بەتاکەکەسێك دەکرێت ، تەنها ئەم تاوانە نەبێت ، بە دووکەس نەبێت ــ نێرومێ ــ بە ئەنجام ناگات •• کەچی نێرینە کە وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچێتو ڕزگاری بێت و سەرەڕای ئەمەش بیبێتە مایەی شانازی بۆی •• ! ئنجا هاوکارەکەشی واتە (مێ)ینە کە تاوانبارو سەرزەنشت بکرێتو سوکیو ڕسوایی هەر بۆ ئەم بمێنێتەوە ، نەك هەر بۆ ئەمو بەس بەڵکو ئەو نێرینانەش بگرێتەوە ، کە دوورو نزیك پەیوەندیەکیان بە (مێ)ینەکەوە هەیە ••!

بەم بۆنەیەوە کارەساتو پەندێکم بیرکەوتەوە کە لەجەنگی سەربەخۆیی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا ڕووی‌دا ئەویش ئاهەنگی چاییەکەی بۆستن‌ـە ( Bustone Tea Party ) دێن بۆ شوێنە ونی

جلی هیندیە سورەکان لەبەر چەند کەسێك دەکەن ، بەم بەرگەوە دەچنە ناو ئەو کەشتیانەوە کەبارەکانیان چایی ( کومپانی‌یەی بازرگانی هیندی

ڕۆژهەلاتە •• )بارەچاپیەکان بە ئاشکرا لەبەرچاوی خەلـکی فرێدەدەنە دەریاوە ، تا وای دەرخەن ئەم ئیشمەهیندیە سورەکان کردویانە ••! ئەم جۆرە کردەوانە لەناو کۆڕو کۆمەلە سیاسیەکانیشدا هەیە بەناوی هێلـی لارەوە ( خط مائل ) بەمەسی :

أ ـ لادانی بزوتنەوەی ناوبرا لەئامانجە سەرەکیەکانی خۆی بـۆ ئەوەی سەرنەکەوتن یارو یاوەری بێتو نوشوستی بمێنێت •

ب ـ تاکو بزوتنەوەکە بکەوێتە دەستی ئەو بەرەو تاقمەی کـە هێلە لارەکەی پێوەیەندە وفرستادەی نەهێنیەتی بەسەر بزوتنەوەکەوە ••!

ح ـ هەستان بەهەندێ کردەوەی ناشیرین لەپەنای ئەمداو بەناوی بزوتنەوەکەوە ، بۆ شکاندنو ناوزڕاندنیـان لای خەلـکیو کەسانـی ساویلکە ، تا لە بزوتنەوەکە ، دووریان خەنەوە ••

ء ـ دەستنیشانکردنی ئەو کەسانەی کە لە ناو بزوتنەوەکـەدا ، چـالاکیو دەورێك و جێـگەیەکیتایبەتیان هەیە ، بۆ مشور لێخواردنیان لە ئایندەدا ••!

هـ ـ نانەوەی دووبەرەکیو کەرتو پەرتکردنی بزوتنەوەکـەو هەلوشینی بە شێنەییو بە ئاسانی ••! بـە ڕاستی ئیسـتیعمار گەرانـی ئینگلیزو شاگردەکانی لەم کارانەدا زۆر یلیمەتو شارەزان • کوردواتەنی تیایدا بونەتە : ( شۆڕێ ، کەڕۆژی حەوتجار خۆی دەگۆڕێ ••!! )

تاکو باشتر دەست بخەینـە سـەر ( سیناریسـت )و دەرهێنـەری ڕاستەقینەی ئەم بەندو بالۆرەیەی : ( لادانی هەقەکان لەئاین ) •• هتـد سەرەڕای ئەوەشـ کەکـەمو کوڕیو ناتـەواوی کۆمەلایەتیشـ بەسەروبەرەوە ، لەهەمو لایەکەوەو بەهەمو بارێکدا لە خزمەتو پێناویدا

بوه خوا هەڵناگری ( سپناریست )یش وەستایانە دەماری هەندێ کۆڕو کۆمەڵی گرتوەو بەکاری هێناون‌و خستونیە هەلەکەسەما بۆ مەبەسی خۆی ••! دەبا بە ڕاگوزاریش بێت تەماشایەکی کتێبەکەی مستر ( سی•جی• ئەدموندز ) بکەین کە بەناو ونیشانی ( کرد ، ترك‌وعرب)ەوەیە کەوا کورتە باسێکی ( هەقە )کانیشی تێدایە ، گەرچی باسەکەی کورتە •• بەڵام لەوکاتەدا بە نیسبەت ( هەقە )کان‌و جێ‌و شوێنی ڕەسمی دانەری کتێبەکەوە ماناو بایەخێکی گرنگی تایبەتی هەیەو گەلێك شت دەگەیەنێت ، بە کورتی سەرەتای هێرش‌و گەمارۆدانی ( هەقە )کان ، لەپێشەوە لەلایەن ئەوەوە ، وە یا ئەوانەوە ••! با تۆزێکیش لەم ڕایەی ( ئەدموتند ) بکۆڵینەوە کەلە کتێبەکەیدا هاتوە •• هتد ، لەلاپەڕە ( ١٨٧ )دا دەڵێت : [ گوایا لەمەفرەزەیەکی پۆلیسیەوە بیستوە ، کە چون بۆ ( هەڵەدن ) بۆ تەبلیغات‌و ڕاگەیاندن ، کەلەو سەرەوە گەڕاوەنەتەوە بە ( سەرگەڵو )دا ( هەقە )کانیان دیوە ، بەگەلە بە نێرو مێوە ، لە حەوزی مزگەوتدا ، سەگیشیان پێبوە مەلەیان کردوە ]•• تاکو وەهای دەرخات کە لادانی ( هەقە )کان لەموقەدەسات‌و نەریتی کۆمەڵگە دووجار برژاوە ••! بەڵام تام‌و لەزەتی خۆی بەوشایانی زێدە نەفرەت لێیان لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە ••! بۆیە بەو شێوەیە ئاو ملی‌سەگیان دەکات ، چونکە بەپێی ( حدود )و سنوری ئیسلام ئەویش دەزانێت هەر کردەوەیەك لەو کردەوانە ، سەرپێچی‌یەکی تایبەتیە ، لە سنوری ( مکروە ) دەچێتە دەرەوە ، تێکەڵ بە ( حرام ) دەبێت ••! ئنجا بۆ ئەوەی ئیشەکە لە ( هەقە )کان ڕەق‌و سەخت‌تر کات ، تا زیاتر کوشندەتر بێت بۆیان ، ئەم هاتوە لە شوێنێکدا تێکەڵی کردون کە لای خەڵکی ڕێزێکی تایبەتی هەیە ، بۆ ئەوەی زیاتر دەماری خەڵکە ساویلکەی پێ بگرێت دژی ئەوان ، هەرچەندە ئەم مەسەلەیە ، باسێکی ناسکە ، بەڵام

بۆ ڕوون‌کردنەوە و زوو کۆتایی پێ بێنین ، دروستە ئەگەر موعادەلە ماتماتیکیەکەی ٢م جۆرە دابنێین ، دوای ئەوەی نیشانەی کەرەسەکانی موعادەلەکە بەم پیتانە دیاردی دەکەین : (هـ = هەقە)،( موقەدەسات = ع)، ( مەلەکردنەکە بەنێرومێوە بە گەلە = ل )و ( حەوزی مزگەوت = م )، و ( سەگ = س ) •• ئیتر لای مستر ( سی•جی• ئەدموندز )هەقەکان ، وەیا : هـ = + ( ل+م+ س ) ••، وەیا هـ = ـ ( ل‌ـم‌ـس )ئیتر وەکو دانەری کتێب مستر ( س • جی • ئەدموندز )دەڵێت : •• هـ = ـ ع •• !

ئنجا دوای ئەوەی کە نوسینەکەی ئەم بە تەرازووی کارەساتە ڕاستەقینەکان بەراورد و بەرەوڕوو دەکەینەوە، ئەوسا دەردەکەوێت کە وا ( کێ ) !؟ لە ڕاستیدا داهێنەرو دەرهێنەری ( سیناریست )ی بێ ئاینیو لادانی ( هەقە )کانە لەڕەوشتو نەریتی کۆمەڵگە پیلانو پەنجەی (کێ)••، چ لایەك لەم بەندو بالۆرەیەو پڕۆپاغەندەیەدا،دەوری سەرەکیو جوڵاندنو هاندانو ئاڕاستە کردنی هەبوە ••! بێ ئەوەی بەلای ( شی‌کردنەوەی ) مەلەکردنەکەدا بچینو بی‌خەینە بەر ، ژێوکەوانی پرسیارو وەلام••چونکە وەکو خۆی دەڵێت پۆلیس ! بۆیان گێڕاوەتەوە•• پۆلیس سەرچاوەی شارەزاییەکەی ئەم بوە لەم بارەیەوە ••! پۆلیس ئەو دامو دەزگایەی کە بەشی ئاشکراو نەهێنی‌یەکەی C. I. D. دەستنێژی خۆیانو ئەمان بناغەیان دانابو •! ئەمە وادەگەیەنێت کە ( هەقە )کان زووتر خرابونە ژێر چاودێری Control ئەم دامو دەزگایەو پیلانەکانیەوە ••! بەلام ئەوی گرنگەو بایەخێکی تایبەتی هەیە ، لە ڕوون‌کردنەوەو دەرخستنی ئەم باسەدا ، تەنانەت مستر ( سی •جی • ئەدموندز )یش نای‌شارێتەوەیە : کە یەکەمجار چاوی بەخوالێ‌خۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە کەوتوە ، لەفەرمایشتەکانیدا وەکو ئەم

دەڵێت : ( حیکمەتێکی دنیایی ) تیدا دیوە ..! ( هەمانسەرچاوە ـ کتێبەکەی ئەدموندز ـ کرد ترك و عرب ) .. ئنجا سەبارەت بەوەی کە دانەری کتێبەکە نوێنەرێکی بەرزو گرنگی حوکومەتێکی (داگیرکەر)بوە لە وەزارەتی ناوخۆی حوکومەتی وڵاتێکی (داگیر کراوو دەستبەسەردا)و پایە بڵند بوە تیایداو فەرمانبەرێکی بەرزو فەرمان رەو بو .. هتد بۆیە لەهەمو گفتوگۆکانی ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەدا هەر تەنها (حیکمەتە دنیایە)کانی لەمەڕ ئەم سەرنجی (ئەوی) ڕاکێشاوە ..، یەعنی شتێك بۆ ١ـ پێداویستی فەرمانڕەوایەتیەکەی سودی هەبێت ..، ـ ٢ـوە یازیانی پێ بگەیەنێت وبۆ پاشەڕۆژی دەسەڵاتیان وەزنگی هەبێت ، وەیا ببێتە کۆسپ لە ڕێبازی دەسەڵاتیاندا ئەم دوانەی بەلاوە گرنگ بوەو هیچیتر ..! بەکورتی بە دوربین ( تلسکوب )ی ئیشو ئەرکەکەی تەماشای کارەساتە کۆمەڵایەتیەکان دەکات .. تاکو ( بۆلبژێریان کات ، کامیان بە کەڵکی ئەو دێت ئافرەینی کات ( O. K, )و دەست بدات بەپشتیدا .. ئەویتر کەبۆ ئەو دەست نادات و سودی بۆی نییەو کۆسپە ..! نەك هەر پەڕی کات و نەفرەتی لێ بکات بەڵکو خەڵکی تریشی لێ هان دات ، تا گەلەکۆمەکی لێ بکەنو ڕسوای کەنو هەر لەبێشکەکەیدا بێتاسێنن ..! نەبادا ئەم ( حیکمەتەدنیا )یانە ، گەورەو پێڕەوکە بنو بچنە ناو جەماوەرانی رێبازەکەی (شیخ)ەوە ، و تەشەنە بکات و خەڵکی پێوە بنیشێتەوە و پەرە بسێنێت و بیسەلمێنن و بڕوای بکەن ، ئەوسا ببێتە هێزێك چونکە تێکەڵ بەباری ژیانی ڕۆژانەیان دەبێت ، و دەبێتە بەشێك لە ژیانو گوزەرانیان و پەیوەندایەتی لەگەڵ باری ژیانی دنیای ڕوونیاندا پەیدا دەکات ، نەك لەگەڵ باری قەبری تاریك و نوتەك ، کە تورەکەی سەر دەکرێتەوە ..!

خۆ ئەگەر خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، لەو شێخانە بوایە ، کەدەمی لە کاروباری دنیاییەوە نەدایە ، وەیا دەمی تێوەدانەکەی هەر بەش‌بەحاڵی خۆی بوایەو بەس ..! وە لای جەماوەرەکەی سەربە ( خۆی ) نەی‌درکاندایەو ئەمانی پێ خەبەردار نەکردایەوە ، وەکو پێشتر لەگفت‌وگۆی سوفیەکیەوە شتێکمان بۆ دەرکەوت ..، وەیا کوێرەوەری‌و کوڵۆڵی جەماوەرەکەیی بدایەتە پاڵ ( بڕواو موقەدەساتە )کەی خۆی ..! بێ چەندوچون بەمەش دەم کوتی بکردنایەو هۆ دنیایەکەی تێدا بزر کردایە ، کەڕەوشتی ( ئەدموندز )و سیاسەتی ئەوانیشی تێدا بزر دەبو .. وەها پاساوی جەماوەرەکەیی بدایەوەو پەروەردەی بکردنایە ..! وەیا پیرو شێخانی ( هەقە ) مێملی کفن بونایە و ( مرید )و مردویش گۆڕبەگۆڕ ..! بێگومان ئەوسا لای مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) و ئاشناکانی‌و ئەوانەی کە ( قسەکەی ) ئەمیان کردوە بە ویردی دەمیان بەرامبەر بە ( هەقە )کان .. لەم بارەیاندا خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەو شێخانی سەربە ( هەقە ) دەبونە شێخێکی نورانی ! و ( هەقە )کانیش دەبونە فریشتە ..! خۆ ئەگەر بەسوسەیەك سوکە پەیوەندایەتیەکیان لەگەڵ ( پیرانی ئیستیعمار )دا هەبوایە ، بێ‌چەندوچون لە بارێکی‌تردا دەبون ..! ئنجا لەم حاڵەتەدا مستر ( سی . جی . ئەدموندز )و ئاشناو ڕۆشناو یارو یاوەرانی لە ( ماڵخو )کان ئامادە دەبون بەوپەڕی شانازیەوە لەکەل‌و پەل‌و تفاقی دنیایی هەرچی دڵ بیخوازێت بە ( دڵخواز )یشەوە ! پێشکەشی بکەن .. بەڵکو موڵك‌و ماڵی میری‌و دەوڵەت لەلیستەی دەورو تەسلیمدا دەبون ، پێشمین ( السلف )بۆ پاشینی ( الخلف )دەور دەکردنەوە بە ئامۆژگاریەکی دەست‌درووەوە نەك جەڵەبی ..!! کە سەرئەنجام دەبو بەخێرو بێر بەسەریاندا دەڕژا ..! تەنانەت شارەزایی عیلمی‌و کیمیاگەری‌و

دەرمانسازیەکەی لەمەر خۆیان ( فارمۆکۆلۆجی ) دەخستە پێناو ، وژێـر پێڵاوەکەی ( شێخ )ەوە ، وردەیەك لە ( مرکباتی فۆسـفۆڕ )یان بـۆ پێـوە دەکرد ، تا شوێن پێ‌کەی لەتاریکیدا بدرەوشێتەوەو نـوری لـێ ببارێت !
( کارەساتەکەی شیخ سلیمان المرشد لەسوریة لە کۆتایی ساڵانی چـــلدا ١٩٤٦ ••! )تـا مریـدو مەنسـوبو مەحسوبەکانـی بەجەمـاوەری بێ‌لایەنیشەوە •• هتد لەئاستی توانا نەهێنیەکانی زیاتر سـەر سـام‌بن ، بڕواو متمانەی پێ‌بکەن ••، تاهەمیشـە کـۆڕی پیشـەو بازاڕی نـازو ئیعجازی !! گەرمتر بێت •• ئنجا ( شێخ )خوێشی دوعـا گۆو شـوکرانە بژێری ( بەخشندەی ) ئەو بەهەشتەی سەرزەویە بێت کەلەم دنیایەدا ، لەساو پەنای موقەدەساتەکەیەوە بۆی ڕەخساوەو دەسـتی کـەوتوە ••!
ئەگینە هەرگیز خوالێ‌خۆشبو ( شێخ عبدالکریم )ی شەدەڵە بەو دەردە نەدەچو ، کەچو •• لەبارو زروفیـکی نەهێنی‌دا لەتەنگی بانگی شێواندا بەپلارێـکی نەهینی یەوە نەدەبو ( الاغتیال ) ••، بە لولاقی شکاو ، و دڵی شکاوەوە سەر بنێتەوە ••!

ئیتر ئەوی بەلای مستر ( سی • جی • ئەدموندز )ەوە زۆر گرنگەو حـەزیش دەکات بەخەڵـکی‌تریشی بگەیەنێت ، و کۆڕو کۆمەنی‌تریشی پێ بوروژێنێت لە ( هەقە )کان ، تابینە یارمەتدەرێـکی خۆی‌و نیمچـە گەلەکۆمەکیەکیان لێ‌بکەن ، کە سەرئەنجام جم‌وجوڵو کردەوەی خۆی‌و یارو یاوەرانی دژی ( هەقـە ) کـان لەغەڵبەغەڵبی ، ئـەم گەلەکۆمەکیەو گەڕەلاوژەیەدا وون دەبێت •• دەبۆیە پێشیان دەکەوێت‌و سەرمەشـــقیان دادەدات تاقسەکەی خۆی بلێنەوە ••! بۆچی ؟ چونکـە قسـەکەی ئـەم لەگەڵ « دواکەوتویی‌و ناشێتی ئەواندا ـ واتە خەڵـکەکەدا دەگونجێت‌و دەنگ دەداتەوە •• بەمە دەماری‌نەفامی‌و هەرزەیەتیان دەگرێت ••• هتد سەرەڕای‌ئەمەش بە تیرێك دوو نیشـان دەشـکێنێت : ( أ ـ دوژمنـــە

کلاسیەکەی ڕژێمی وڵاتەکەی خۆی لای خەڵکی سوك دەکات ••، ئەو دوژمنەی کە هەمیشە مایەی سڵکردنەوە وسەر ئێشەیانە ، بە جۆرێك کە زمانی حاڵیان دەڵێت : زینهار هەرچیەك دەبن ، ببن تەنها ئەو دوابڕاوە مەبن و توخونی نەکەون ••!! ب ـ بەوانەشەوە کـە وا بۆنێـکی ئـــەو دوژمنە ، ئەو دوابڕاوەی لە مەڕ ئەوانی لێ دێت ، لە وڵاتانی‌تردا •• ) بۆیە بەو جۆرە بۆ بابەتی ( هەقە )یەتیەکە چوە •• بۆیە بە ( هەقە )کان دەڵێت : ( جۆرێك لە کومونیستی ماڵ و موڵك و ئافرەتـی تێـدا بـەدی دەکرێت ••!! )هەمان سەرچاوە ـ کرد ، ترك و عرب دانەری مسـتر ( سی • جی • ئەدموندز ) لاپەرە « ١٨٧ »

با درێژەی پێ نەدەین و لەکورتی بی‌بڕینەوە ، کوردشـی دەڵێت و ( قسە هەزارە و دوانی بەکـارە ) •• ئـەوی کەڵکەڵـەی کۆمۆنیسـتی لەکەڵەدا بێت ، واتە بیەوێت گومەڵـکە بکات خاوەنی هەموشتێك وماڵ و موڵـکیش بە خاوەندایەتی گشتی ( ملکیـە جماعیـة ) ئەمـە ئـافرەت ناگرێتەوە ، چونکە ئافرەت لەڕووی ئابوریەوە نەماڵەو نەموڵك و نەبەرهەم Production) و نەهۆی بەرهەم هێنان (Production Means) مەگەر لە بەرهەم هێناندا ، وەك کرێـکارێك وابێت ••

مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) لێرە ، لەم وڵاتە دەیەوێت بـــە ئافرەت بە (مێ)ینە بەر هەڵستی لەومەترسیە بکات ، کەبخایەنێ و نەخایەنێ هەر ڕوودەکاتە خاوەندایەتی ماڵ و موڵك ! کـەچی لـە وڵاتی خۆیاندا ، بەر بەرە لاکردن بۆ ( نێربازی ! ) بە پێی یاسای (Legal Sodomy) بە ئازایەتیەك دەژمێررێت بۆ ئـازادی فـەردی ••! و بە دەستکەوتێـکی گرنگی ئەم ئازادیە دەدرێتە قەڵەم ، ئەو ئازادی‌یەیە کە مافی خاوەندایەتی موڵك و ماڵی پێ دەپارێزرێت لای ئەوان ••! ئـەو دەسـتکەوتە کـــە

وێرانکاریەکی ئاشکرایە بۆ هەمو کردارێکی سێکسۆ ـ فسیۆلۆجی لەمەڕ ئادەمیزاد کەوائەنجامی ساماکی لەڕووی سۆسیۆلۆجیا ، ئادەمیزادیتی‌یەوە ، لە تێکدانو کاول کردنی مەڵبەندی سروشتی ( تخريب البيئة الطبيعية ) خراپترە ، چونکە بەپێچەوانەی ڕێبازی بایۆلۆجییەوەیە !! ئیتر ناوهێنانی ئافرەت لەم ڕووەوە دەغەڵیەکی تێدایە •• هەروەها تێوەگلاندنیشی بەم چەشنە ، تەنها مەگەر لای لایەنگرانی ئەو رژێمە کۆمەڵایەتیانەوە دروست بێت • کورد واتەنی کە ( نێربێ‌و مێبێ بۆ دۆیدەوێ ••!) بە وتەیەکی‌تر ، کە لایان وایە هەموشتێك لەپێناوی سودو قازانج‌و گیرفاندا کارێکی دروست‌و بەجێ‌یە ••!

بەلام مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) بۆچی بەو جۆرە دەگێڕێتەوەو ترش‌و خوێی پێوە دەکات ••!؟ ئەمەیان گولۆپێکی سەوزە هەڵی دەکات بۆ ئەوانەی کەشێت‌و شەیدای ماڵو موڵکن ، کەبوبون بەخاوەنی ، وەیا بۆ خاوەندایەتیەکەی ـ بە مەرجێك تەنها خوێن لەلوتی خۆیان نەیەت ••! لایان وایە هەموشتێك هەرزانەودەهێنێت بخرێتە پێناوی‌یەوە ! بۆیە خاوەندایەتیان ئەوەندە لەلا گرنگە ، لەهەمو شتێکی‌تر ، زیاتر ، شایانی ڕێزو پەرستن‌یانە ! گولۆپێکی سەوزە هەڵی‌کردوە بۆ ئەوانەی کەوا زێوان‌و پاسەوانی نەریت‌و داب‌و دەستوری کۆمەڵکەن کەپاراستن‌و بەرگری لەو ( خاوەندایەتیە ) بەچەکی بیرکوژ ! لەگەڵ چاودێری‌و ڕاگرتنی بەپاك‌و خاوێنی ، و ئاگادار بونی •• ئەرکێکی سەرەکیە لەبابەت‌و فەرمانی پاسەوانی‌و زیوانیەکەیاندا ••! تا کەس نەخەڵەتێ‌و نەوێرێت ، بە خراپە باسی ئەو خاوەندێتیە بکات کە لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ( خانەدانیشی ) ! پێوەیە ، سەرئەنجام پڕکێشمی نەکات دەستی فەوتانی بۆ درێژ کات ••! با ئەو خاوەندایەتی‌و خانەدانێتیەش

گەیشتبنە ڕادەیەکی وەهاکۆمەڵانی خەڵکی یان هێنابێتە قاقوزا ،و کۆمەڵگەشیان پەرێشان و دەرمان خوارد کردبێت ..!

بەڵێ ئەمانە هوشیار دەکاتەوە تا بجولێن مەترسیەك ڕووی تێ کردون ..! بۆ ئەمەش وەکو مستر ( سی . جی . ئەموندز )دەڵێت : هەندی لەبازرگانە بەڕێزەکانی توتن دەبن بەشایەت ، کە گوایا لای میری شکاتیان لە (هەقە)کان کردوە لاپەڕە « ١٨ » هەمان سەرچاوە ـ کتێبی کرد ، ترك وعرب ) ئەو بازرگانە بەڕێزانە کە هەمیشە مایەی نابوتی و کوێرەوەریی بون بۆ « توتنەوان » لەبیست نۆزدەیان لێ قول دەدان ..! دیارە شایەتی ئەم دەبێت کەسانێك بن کەلە کەنەفت و کۆڵەوارکردنی خەڵکیدا چەپیان لەم کەمتر نەبێت ..، وەیا وەکو شایەتەکەی مامڕێوی بن ..!

ئەگینە بۆچی دەبێت کابرایەك لە هەندەرانەوە هاتبێت ، فری بەسەر بەسەر هیچ ئاینێك و موقەدەساتێکی ئاینیەوە نەبێت ، بەتایبەتی میللەتی ئینگلیزیش ، کەبە سروشت و ڕەوشت کزی ئاینن ـ گەرچی لەڕووی مەدەینەت و شارستانێتی یەوە پێشەنگن و ئێجگار بلیمەتن ... کەچی لێرە ..، لای ئێمە ئەوەندە بەتەنگ موقەدەساتەوە بێت ، بۆی بێتە شیر ! و ببێت بە گزیرو مجەور بۆحەوزو ئاوی مزگەوت .. بۆچی ( کاسە لەئاش گەرمترە ..!)وەکو گەڕوسەکان دەڵێن ـ ئاش واتە چێشت ـ

بەم بۆنەیەوە ڕووداوێکی ڕاستەقینەم بیر کەوتەوە کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و شکاندنی دەوڵەتی ( عثمانی )و داگیر کردنی عیراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ڕووی دا : ـ

ئینگلیزێك دەکرێت بە حاکمی سیاسی و فەرمانڕەوا لە ( موصل ) ، مەسیحیەکانی ئەم ناوچەیە ، زۆریێ خۆشحاڵ دەبن و دەگەشێنەوە ، کەوا

مەسیحیەكو ( برایەكی‌دینی ) ! وەكو خۆیان فەرمانڕەوایەكی بەرزە لە ناوچەكەیاندا •• وە بەپێویستی دەزانن كە هەندێ لە قەشەكانیان بــە سەرۆكایەتی یەكێــیان بچن بۆ بەخێرهاتن‌و پێشوازی كردنی •• لەكاتی گفت‌و گۆدا سكاڵا دەكەن ••، بێزاری دەردەبڕن ، كە گوایا خەڵــكــی ناوچەكە سەغڵەتیان كردون‌و ئازاریان دەدەن ، زۆر بەگەرمی تكای لــێ دەكەن كە فریایان كەوێت‌و یارمەتیان بدات ، فەرمانڕەوا لێ‌یان دەپرسێت هۆكەی چی‌یە ••!؟ ئەمانیش دەڵێن : لەبەر ئەوەیە ، ئەوان موسوڵمان‌و ئێمەیش ( مەسیحی )ن •• ! فەرمانڕەوا ئینگلیزەكــە لەوڵامــدا پێ‌یــان دەڵێت : ( كەوابێ بڕۆن موسوڵمان بن ••! ) بەم جۆرە قوڕوقەپیان پێ دەكات •• !

## ( ٨ )

بەش بەحاڵی خۆم گومانم هەیە کە دانەری کتێبەکە ( کرد ، ترك‌و عرب ) ئەوەندە ساویلکە و بەسەزمان‌و خۆش باوەڕ بێت ، وا بەسادەیەتی لەمەسەلەکە ، گەیشتبێت وەکو تاوان‌و لادانێك (Deviation) دەی‌داتە پاڵ ( هەقە )کان وەکو بەو جۆرە وا بەساکاری‌و سەرپێی بۆ بابەتەکـە دەچێت •• ! چونکە وڵاتەکەی خۆی گوایا مەڵبەندێـکی دێرین‌و گرنگی دیموکراتیەتە •• هەرگیز عەقڵ ناگرێت کە ئـەو ناگرێت کـە ئەو لـەم بابەتەوە هیچی نەبستبێت وەیا نەخوێندبێتەوە ، تەنهـا هەر ئەوەندەی لێ بزانێت هەروەکو لەکتێبەکەیداو ( بەزەقی دەری خستوەو پەنجەی بـۆ ڕادەکێشێت ! بەتایبەتی ئەو بابەتەی کەوا مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) بەو جۆرە باسی دەکات • دامەزرێنەرەکەی زوربەی ژیان‌و چـالاکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لەئینگلتەرەدا بوە •• تەنانـەت ئابـوری سیاسـی ئینگلیزی بەشێـکی بەبایەخ‌و گرنگ بوە لەلێکۆڵینەوە وتێ بینیەکانی •• خۆ دانراوەکانی ( المؤلفات ) لـە خوێندنگەو کۆلێجەکانی بەشی زانیاری مرۆڤایەتی (Human Sciences) دا لەهەمو زانکۆکانی ئینگلتەرەدا دەخوێنرێن ••، تەنانەت ئاو وگڵی ئەوێی بەنسیب بوەو لەگۆڕستانێکی بەناوبانگی ( لندن )دا نێژراوە !! ئیتر بۆچی والێرە خۆی لەئێمە گێـل

دەکات ..؟! لەمەدا گلەیی لێ ناکرێت چونکە فرستادەی دەوڵەتێکی داگیر کەرە ، پەیامی ئەوی پێیە ..! فەرمانی دەوڵەتەکەی خۆی بەجێ دەگەیەنێت لە وڵاتێکی داگیر کراوودەست بەسەردا ، کەوا سەروژێری خاکی وڵاتەکەی پڕە لەگەنجو سامانی ئابوری ..، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە ، ئەمەی ئەو نیشانەیەکە ، لە نیشانەکانی بلیمەتی و گونجانو سەرکەوتویی لەبیرکردنەوەی ئیستیعماریانەیدا کە لەم ڕووەوە ، ئەمان حەوت بەردیان داوە بەپشتی هەمو ئیستیعمارگەلانی جیهاندا بە درێژایی مێژووی پڕ مەینەتی ئیستیعمار بۆ بەرەی ئادەمیزاد .. وە لە بەرپاکردنی ئاشوبو ئاژاوەشدا هەوێنی حەوت قازان شیرن ، بۆیە بەلای ئەوەوە : یانێکەو دوو هەوا ..؟!

بەڵام ئەوی شایانی باسەو جێی گلەیی بۆچی هەندێ کۆڕو کۆمەڵی هاونیشتمانیو ماڵخو ..! قسەکانی ئەو بڵێنەوە بەهاونیشتمانەکانیان ..!؟ لەکاتێکدا « ئەو » بەحیسابی ئەمانەیش زۆر دوورە لەبیرو باوەڕی ئەو کۆڕو کۆمەڵەهاونیشتمانیانەوە ..! ئەگەر مۆری ( فاسق )ی بەناوچەوانەوە نەبێت ..، کەچی بێ لێکۆڵینەوەو (فتینوا) وتەکانی مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) بکوتنەوە بەچاوی ( هەقە )کاندا ..! سەرەڕای ئەمەش ئەگەرهاتو بەم هاونیشتمانیانە ، وترا کەسی کاکی بەم لاسایی‌کردنەوەو کردارانەتان بە « خۆڕایی » خزمەت گوزاریەکە بەو ..! لەوانەیە توڕەو بەرزەبڵێس بن ..!

دوای ئەوەی کە مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) وەیا (سیناریست) دەرهێنانی بابەتەکەی بەکاکڵو توێکڵەوە زۆر بەوردی بو بەوەستایی لەناو کۆمەڵگە فراوانەکەی کە ( هەقە )کانی تێدا دەژین هەڵدەبژێرێتو ئامادە دەکات .. سەرەڕای ئەمەش ، جێو شوێنو مەرکەزی ڕەسمی

فەرمان ڕەوایەتیەکەی زیاتر یارمەتی داوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەبەسەکەی بە ئاسانی •• دێت تۆمەتی جۆرە کۆمونیستیەك بە « هەوەسی خۆی » ! گەلاڵە دەکات‌و دەی گرێتە ( هەقە )کان •• تاخەڵکی لێیان بسڵەمێتەوە ، ئەو تۆمەتەی کە جاران لەبرەودا بو ••، ئەمڕۆش سەبارەت بەنەگریسیی‌و نالەباری بەکارهێنەرانیەوە ! وەکو تۆمەت‌و تاوان بازاڕی هاتۆتە کزی‌و تەوژم‌و تەزووی جارانی نەماوە •• چونکە خەڵکی بە تەجروبەو تاقی‌کردنەوەی خۆی بۆی دەرکەوتوە کە مەترسی ڕاستەقینە لە لەق‌بونی بایەخ‌و باوەڕ ( القیم والافکار ) لەڕاستیدا لەوەوە پەیدا دەبێت کە ئەو بایەخ‌و بیرو باوەڕە لە پلەی یەکەمداو لە سەرەتاوە لەلایەن هەڵگران‌و پاسەوانانی‌یەوە دەکرێت بە قوربانی کەمایەتیەکی زۆر کەمی کۆمەڵگەکە •• لە لێکدانەوەو سورکردنەوەیدا دەکرێت بە قوڕگی ئەم کەمایەتیەدا •• کەچی زوربەی زۆری کۆمەڵگەکەش زەقەی چاوی دێت •• سەرەڕای ئەمەش ئەو زوربەیەی پێ‌دەم کوت‌و سەرکوێر دەکرێت بۆ بایەخ‌و بیرو باوەڕەکە لەق‌و شلۆق دەبێت ••!

بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەم لایەنەو پاشقول‌گرتن لە بیروباوەڕ بۆ سودی تەنها ( لایەنێك )! ئەم سەرگورشتەیەتان بۆ دەگێڕمەوە : ـ دایکێك لەگەڵ منداڵێکی چوارپێنج ساڵی خۆیدا شەوێك بە میوانی دەچێتە ماڵی ناسیاوێکی •• لە ڕێگە گەلێك ئامۆژگاری منداڵەکەی دەکات ، کە لەوێ چا نەخواتەوە ••، تاکو شەو کە نوست جێگەکەی خۆی تەڕ نەکات ••! چونکە باوەڕێکی وەها هەیە لەبابەت تەڕکردنی جێگەوە لەلایەن منداڵەوە •• کە دەچنە ماڵەکە ، منداڵەکە دەبینێت دایکەکە لەپەستادا ، چای خەست‌وشیرین دەخواتەوە ! منداڵەکەش خۆی پێ ڕاناگیرێ‌و دەتەقێتەوە ، بە دایکی‌دەڵێت : ـ تۆ نەك هەرجێگەکەت تەڕ ••، بەڵکوخۆت پیس دەکەیت ••! ئیتر سەبارەت بەم ڕاستیە گورچك

بڕە ، ڕۆژبە ڕۆژ تۆمەتەکەی ئەمیش کزولاواز بوە بەرەو ئاوابون چوە لەڕابەری ( قاموس ) ) زاراوەی ئەوتا وانانەدا کە دەربارەی کۆمەڵگە دەکرێن ••! هەرچەندە لە هەڕەتی نوسینەکەی ئەمەو ، لەسەرەتاوە ، هەبو وای دەزانی کەوا دەست وەشاندن ، لەمجۆرە ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەو ، ئەو بیرو باوەڕانەی کەلە ڕێڕەوی پێگەیشتن‌و گەیشتن‌و گەشەکردنی کۆمەڵگەکەدا پێداویستی‌ژیان‌و گەشەکردنەکەی دەی‌هێنێتە ئاراوە ••هتد دەست‌وە شاندنیان بەشتێکی باش‌و دەستکەوتێك دادەنا بۆ خۆیان ••! نەیان دەزانی دوای جەزرەبەو دەست‌وەشاندنەکەیان ، ئەمانیش هەر «باراشێك»! بە ساغ‌و سەلیمی دەخۆن ••! بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەم مەسەلەیە ، دەڵێین لە ڕووی بایۆلۆجیاوە : لە ئافرەتێکی سك‌پڕ (حاملة) دەچن کە دەیەوێت منداڵەکەی لەبار خۆی بەرێت •• بەلام « لەباربردنەکە » بە نیسبەت تەندروستی ئافرەتەکەوە بەگشتی ئەنجامەکەی دووبەختی‌و سامناکە ••!

ئنجا مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) دوای زەوی خۆش‌کردن بەم قسەو قسەلۆکە بۆ هەنگاوی دووەمی ئیشەکەی دەکەوێتە کار ، دەست دەداتە چەکی گێرەشێوێنی : چەکی( پەرت‌کەوسەرکەوە = فرق تسد ) ئەو چەکەی کە تائێستاش لە ناوئێمەمانانەدا لە ولاتی تازەپێ‌گەیشتودا ( البلاد النامیە ) بە داخەوە هێشتا چەکێکی بڕندەیەوکول نەبوە •! بۆیە دەست دەداتە ئەو چەکە چونکە مشوری پاشە ڕۆژ دەخوات ، لە ڕووی پاراستنی بەرژەوەندی‌و بەرگری‌کردن لە خۆیان •• چونکە چەکی تەنگ‌وچەڵەم وتەنگانەیانە ، چەکی زامنی پیری‌یە (Oldage Security) بەلام ئەمڕۆ بە دەست دەست‌وپلی پیرێکی کەفتەکارەوەیە «ئیستیعمار»••! ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ( نەبادا ) کەرەسەکانی‌تر بابەتەکەی پووچ بێتەوە ، و توێکڵی بێ‌کاکڵ بمێنێتەوە ، یابە تێپەڕبونی زەمان‌و پەیدا بونی هەندی کارەساتەوە ، چاویان بکرێتەوەو هوشیار بنەوە ، ئیتر

گوێ ڕایەڵی ئەم نەبن ، وەیا لێی بتەکێنەوەو سەری ( ساحێبیان ) ! بخۆن ، بە کورتی بگۆڕێن ، و دەست بگۆڕن بە پێی هەورازو نشێوی کارەساتەکان ئاشناکانیشیان دەستبکەن بەگێڕ گۆڕین ..!

ئیتر بۆ مشور خواردن لە ( هەقە )کان ، لەپاشە ڕۆژی دورنزیکیاندا هەر لە سەرەتاوە مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) هێلانە دۆزیێی بوە بۆ ڕاوکە دانانو لە دەمەودانی ئەمو ئەو ، لەخزمو خوێشانی خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، و لە شێخانی ( هەقە ) وەکو لەدوایدا باسی دەکەین .. بۆ هەڵگرتنی ئەرکی ئەو چەکە بڕندەیە ـ چەکی پەرتکەوسەرکەوە ـ کەلە هەموکاتو شوێنێکدا چەکی بەکاریان بوە بۆ ڕۆژی ( نەبادا ) بە رامبەر بە کۆمەلانی خەڵكو ( هەقە )کانو هیتر تر کە مستر (سی.جی.ئەدموندز)و ئاغاکانی بەپێ سرەوڕیزی فەرمان ڕوایەتیەکەیان گومانیان لێ دەکردن کەوا ڕەنگە لەگەڵیاندا نەبن ..، وەیا ناحەزوکۆسپێك بن لە ڕێڕەوەیاندا ... وەیا دەگونجێت ئەو کۆڕو کۆمەلانەی کە ئەمان سڵیان لێ دەکردنەوەو گومانیان هەبو کە لەوانەیە دڵسۆزیان نەبن ، ئەمیان بن ، و نەئەویان ، تەنها لەوانەن کە دەستیان گرتوە بە کلاوەکانیاندا ( با ) نەیبات .. هتد چونکە سیناریست خۆیشی دەزانێت کوێی دێشێت ..! بەهەستو هونەرمەندی لەچەوساندنەوەو دادۆشیندا .. بۆنی ئەوەی کردوە ، کە بخایەنێو سەرومڕ ، کەرەسەو ئەکتەرەکانی ( ممثل ).. بابەتەکەی ، « نەهێنی » پیشەکەی ( سیناریست )یان لەبەرچاو هەڵدەماڵرێتو ئاشکرا دەبێت ، ئیتر لەبەر چاویان دەکەوێت ، وەیا بە کۆستی خۆیاندا دەکەونو لێیان دەقەومێت ، ئەوسا ئەمیش پرزەی دەبڕێت ..! هەرچۆنێ بێت بابەتەکەی ئەم کەوا بەو جۆرە خۆیی پێوە شەکەت کردوە ، و خەڵکیش دووچاری نەگبەتیو مەینەتیبەرگە ناکات و بەردەوام نابێت ..، ئەوسا

گوێ‌گرو تەماشاکەرانیش ، کە خەڵـکی وڵاتەکەن ، و مەڵبەندو ، وڵاتیان بوە بە شانۆیەك بۆ شانۆگەریە نەگریسەکەی ئەم •• وەهەندێ کەسیش نەك هەمویان ، لەو کۆڕو کۆمەڵانە ، کە ڕێزوڕیزێـکی تایبەتیان هەیەو (سیناریست) بۆ مـەبەسی تایبەتی خۆی خستونیە هەلەکەساماو ، ئاوملی فڕو فێڵی‌کردون‌و دواجـار هـەر دەبنەوە بە قوربانی فڕوفێڵ ••! وەیا کردونی بە توێکڵ بۆ کاکڵی‌بابەتەکەی ( الموضـوع ) •• وەیا ئەکتـەرو شەکەرۆکە ( الراقص )و کەرەسەی ( سیناریۆ )کـەی ، کەپەیتا ، پەیتا لاسایی ئەم‌و دەمەلاسکێ‌ی هەقیقەت‌و ڕاستی دەکەنەوە ••!! لە نەفامیەوە بێت ، یا لە فامیدەییەوە ، ئەگـەر لەنەفامیەوە بێت شایانی گلەیی نی‌یە ؟ گفتارەکانی ئـەم دەجونـەوەو کردویانـە بەدروشـێمك دژی ( هەقـە ) هاونیشتمانیە کانیان ، کەلە هەمو ڕوویەکـەوە ، بێ‌وەزنگـن ••! ئەمـە لەلایەك ، لەلایەکی‌تریشەوە خەڵـکی وڵاتەکە فێر دەکەن هەر لەیەکتری بخوێنن‌و بەربنـە سـەرو پۆتەڵاکی یەکتری و چەواشـە بن‌و نەپەرژێنە سەر ئەوەی کە ( سیناریست ) بۆ بەرژەوەندی ( مشتێك )! لەچاوچنۆکە جیهان خۆرەکانی وڵاتەکەی خۆی سامانی سەروژێری خاکی وڵاتەکەیان بە تالان بۆئەوان کێشەوەو مسۆگەر دەکات ، بۆ ئەم مەبەسەش بە پێ‌ی بەرنامەکەی خۆی لەکاردایە ، نەخشەیەکیان بۆ بکێشێت کە خێر لـــە خۆیان نەبینن هەمیشە دوودەست بەناڵەو دەسـتندە خۆری ئـەوان بن ، ساڵ‌بەساڵ خۆزگە بە پار ، و بە سەردەمی ئەوان بخـوازن ••!! بـەڵام سەرئەنجام‌و کۆتایی شانۆگەڕی‌و چیرۆکەکەی بە نیسبەت ئەوانەوە کـە دەبنە ئەکتەر ، وەیا میکروفون بۆ دەنگ دانەوەی گفتـارو پەسندکـەری کردارەکانی •• کوتومت لە کۆتاییەکانی چیرۆك گێڕانەوەی کوردەواری خۆمان دەچێت کە ئاسایی ( عادة ) بەم‌ڕستەیە کۆتایی دێت : ( لەوسەرەوە کە گەڕاینەوە •• هیچیان نەداینێ ••! ) ئیتر ئاو بێنەو دەست بشۆ ئەمـە

هەمو دەستکەوتەکەیە لەم پیشەیە ••!

بەکورتی ( سیناریست ) وەیا مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) ئەویش هەر لەگوماندایە و دوودڵە ، لەوانەی کەوا ( ئەم ) ، ئەو ڕاوە ژیشکەیان[1] پێ دەکات‌و پشتیان پێ دەبەستێت ، وە ئەم بەیت‌و باڵۆرەیەو ئاوازەیان پێ دەسپێرێت‌و پێ‌لێ دەدات دورنی‌یە کە وا ڕۆژێك لە ڕۆژان لەم بەندوباوەی ئەم تێ‌دەگەن •• ئیتر تەوژمیان لە مەسەلەکەی ( ئەمدا ) سارد دەبێتەوە ، وەیا خود بە هۆی هەندێ کارەساتی‌ترەوە کە لەناوچەکەدا ڕوو دەدات ، ناوچەیەك کە لە قەمچی دەسەڵات‌و ژێر ڕکێفی ئەمدا نی‌یە بەمە باری هەڵسەنگاندن‌و موعادەلەکۆمەڵایەتیەکەی کەرەسەکانی بابەتەکە ئەمیش لاسەنگ بکات •• ! هەروەها دەگونجێت کاریگەری ( التأثیر ) ئەم کارەساتانە سەرجەم ببنە پارسەنگێك بۆ ئەوان ــ «هەقەکان»ــ وباری لاسەنگی یەکتری ڕاست کەنەوە کوردواتەنی ( دۆستی دۆستم •• دۆستمە••دوژمنی دۆژمنم دۆستمە)!!ئیتر ئەم کەڵەك‌و کوڵەکەی «ئەمیش» سەرنەگرێت •• چونکە ئەگەر سیناریست لێرە دەستی بڕوات ، لەولایەی کە ئەو جۆرە کارەساتانەی تێدا ڕوو دەدات دەفی‌دەنگ نادات •• وەیا ناتوانێت کارلە هەمو کارەساتەکان بکات بۆ سودی مەسەلەکەی‌خۆی ،

---

(١) لە هەندی لادێی کوردستاندا بۆ ڕابواردن‌و گاڵتەوگەپ ، بە یەکێکی ناشی‌و نەشارەزا ( ڕاوەژیشکی ) بۆ دادەمەزرێنن : سەر لەئێوارە چەند کەسێك لەگەڵ کابرای ناشیدا دەچنە قەراغ دێ گونیەیەکی خاڵی‌و تەنەکەیەکی ئەدەنێ •• دەڵێن تۆ لەتەنەکەکە بدە •• ئنجا ژیشك کۆ دەبنەوە بیان گە گونیەگەوە ، ئیتر ئەمان خۆ یان دەدزنەوە •• ئنجا کابرای ناشی تا بە خۆی دەزانێت کە ئەنجامی تەنەکە لێ دانەکەی هیچ نی‌یە ، وە ئەم جۆرێکە لەگاڵتەوگەپ ••! لەوانەیە تابەرەبەیان هەر تەنەکەی بەتاڵ بکوتێت•• ئنجا گونیەی خاڵی بباتەوە بۆ ماڵی خانەخوێ‌کەی••!!

ئەمە لەلایەك ..، لەلایەکی تریشـەوە لەناو کۆمەڵگە فراوانەکەی کە ( هەقە )کان بەشێکن تیایدا گەلێك کۆڕو کۆمەڵی‌تر هەن ، کـە سیناریستو ئەکتەرو هاوکارانیشیانی دەدزی ( ڕقی لێیان دەبێتەوە ..؟) باڵە بەر خاتری چـاوی ڕەشی ( هـەقە ) کـانیش نەبێت بەڵـکو لەبەر بەرژەوەندیو کارسازی خۆیان ..! دیسمانەوە دەگونجێت هی‌تریش هەبن ، لەبەر مەینەتیو کوێرەوەری خۆیان ، هەرنەیان پەرژێتە سـەر ئاوڕدانەوەیەك لە سیناریۆکەی ، وەیان هـەر تێ ی نەگەنو سـەرنجیان ڕانەکێشێت چونکە کۆمەڵـگە بێشەیە هەموشتێـکی تێدایە ..! واتـە کاکی سیناریست ، ئەوسا بەقەلەنـدەری بمێنێتـەوە بـە دەردی کـابرا سیوەیلیەکەی لێبێت ، کەلە تاقی خۆیدا کوڕوکاڵ دەوری دابو .. هتد کە کوڕەکانی پێ گەیشتنو هەر یەکەیان چو بە پای کاری خۆیەوەو لێ ی جیابونەوە ..، دۆستێـکی دێرین توشی بێت هـەواڵێ مـاڵو منداڵی دەپرسێت ..، کابراش بە هەناسەساردیەکـەوە دەڵێـت : ( ماوینـەوە ، ئەمنو حەنیو سوزنو بەنێ ..!! ) حەنی واتە ( حنیفەی خێزانی )!

بە کورتی تەماشاکەرانی شانۆگەریەکەی تێـکڕا کەوا زوربـەی زۆری کۆمەڵـگەکەنو بون بە چیرۆکیش بۆ شانۆگەریەکەی لەدیمەنـی ڕووپامایـــی (Flattery) ، و بەپەرۆشیەکەی مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) بۆ موقەدەسـاتی کۆمەڵـگەکەیان بێـزی لـێ ی بکەنـەوەو لـێ ی وەڕســـ (Antipathy) بین چونکە بەش‌بەحاڵی ( ئەم ) ئەو هەوڵ وتەقەلایەی جۆرێـکە لە دوو ڕوویـی ، چونکـە دەیەوێـت موقەدەساتی خەڵـکەکە وەکو لە پێشەوە ونمان کە ( ئەم )فڕی بەسـەر هیچ موقەدەساتێکی ئاینیەوە نی‌یە، موقەدەساتەکەیان دەکـات بە مـایەی ئاشوبو ئاژاوە بۆ مەبەسی تایبەتی خۆی.. بە واتەیەکی‌تر بۆ کارسازی خۆی ، دەستکاری موقەدەساتو هەمو کەرەسەو بابەتێـکی کۆمەڵایەتیان

دەکـــات ودەیشێوێنێت ، تا خەڵـــکەکەی لێ دورکەوێتەوە ، وەیا ئـــەو کەرەسەو بابەتی ڕوشنبیریە ، لەخەڵـکەکە دورخاتەوە بەهەر ناوێـکەوە بێت ، تا لەمێــژووی خۆیــان دوربــن ، تا دووچــاری ســەرکویری و سەرگەردانیی و تامۆیی (Alienation) ببن ، لە ئەنجامدا : خزمەتکاری و نۆکەری بە ئازادی و سەربەستی ، و گەدایی و سواڵـکەریش بە پادشایەتی نەدەن ••! هەمیشە وابزانن ئەو نانەش کە دەیخۆن هەر هی ( ئەوانە ) لەوانەوە دەستیان کەوتوە••!ئیتر لەم ڕێڕەوەدا کە بە ئامانجی خۆی گەیشت هتد کەرەسەو ئەکتەرو هاوکار یەعنی یارمەتدەران،یارو یاوەرانی جارانی تاك‌تاك و جوت‌جوت پەردەکات ••، گۆران واتەنی ئەوسا زمـانی حـاڵی دەڵێت : ( کەی تۆم دیوە ••، کەی ئەتناسم •• کەی کەی کەی ••!؟ ) ئەمە لەچاکترین وەزع و باردا •• ئەگینە ئاشناو ڕۆشنای تازە بۆ قۆناغـی تازە دەگرێت کورد واتەنی : ( بۆرە نەبێت بازە بێت دەست هەوسارەکەی تازە بێت ••! ) ئنجا کە تازەش هات کۆنــە خەڵاتــە ، یــارو یاوەرانـی کۆنیش دەبەخشێت بەو خەڵـکەی کەئەمان لێیان بوبونە مووی لووت و ملۆزم و پواز •• هتد یەعنی دوای سەرەشکێنەو دوژمنایەتـی پێ کـردن دەیان‌داتە دەست دوژمنەکانیان ، واتە سەریان دەتاشێ و ئاوێنەکەشـــیان دەداتە دەست ! بەم چەشنە پشتیان بــەردەداو ، بەپەندیــان دەکــات و ، بەرەوڕووی ڕقی خەڵـکی‌یان دەکاتەوە !! لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا بــۆ هۆنەری بەڕێزی ئینگلیز ( شکسپیر ) کە وتویەتـی : ( ژیــان شانۆیــەو خەڵـکەکەش ئەکتەرن « ممثــل » ) ، لەگــەڵ داوای لــێ‌بوردن لــە هونەرمەندانی شانۆوشانۆگەری ، چونکــە لەپێنــاوی ڕوون کردنــەوەدا کاسەوکەوچکی ئەمانم خواستوەو زاراوەکانیانم بەکار هێناوە ••

بــۆ زێدەڕوون‌کردنــەوە تــا پتــر لــە کــاریــگەری ( التـأثیر Effectiveness) کارەساتە کۆمەلایەتیەکان بگەین لەگەڵ کاسەدراوسێتی و

دەستیاویاندا بە سەریەکتریەوە لە بزوتنەوەی کۆمەڵگەو گۆڕانیدا ..
هتد لەم ڕووەوە لە پیاوێکی داناو شارەزایان پرسی وتیان : زانیاری کۆمەڵایەتی لە هەڵسەنگاندنو بەراورد کردنیدا بە زانیاریەکانی تری وەکو : ( فیزیا ، کیمیا ، وبایۆلۆجیا ، ئەندازە ، و ماتماتیك ، و جەبر ..
هتد )لەکامیان دەچێت ..!؟ هەر چەندە ئەم زانیارانە لە ڕێڕەویاندا ، سەرومڕ کار لە کێشەی کۆمەڵایەتیو گیروگرفتی ( سیاسەت ) دەکەن ...! لە وەڵامدا ووتی : ( زانیاری کۆمەڵایەتی کە سیاسەت « بەرزترین پلەیەتی » زۆرتر لە زانیاری جەبر دەچێت ..، بۆ نمونە ژمارەی (٤) هێنایەوە وە وتی : ـ ( بەپێی ماتماتیك ژمارەی چوار ، هەرچوارە نرخو بایەخی ناگۆڕێت .. ئەگەر بڵێین . سێونیووسێ‌چارەك ئەمە هەڵەیەو چوار ناگرێتەوە ، و ناگاتە چوار ..، بەڵام لە ( جەبر )دا بە بوون ، وەیا بە پەیدابونی نیشانەیەك لەبەر دەمی چوارەکە وەیا هەر ژمارەیەکی‌تردا ، لە بنەڕەتەوە نرخو بایەخی چوارەکە ، وەیا ژمارە ناوبراوەکە ، دەگۆڕێت یەعنی : ـ٤ جیایە لە + ٤ وەیا $٤^{٢}$ جیایە لە$٤^{٣}$ ..) هتد ئەم چوارانە لەنرخو بایەخیاندا جیان لە یەکتری ، ئیتر بەم پێودانە بایەخو نرخی کارەساتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانو بۆچوونیان لە گۆڕاندایە ، کە ئەگەر کارەساتو گیروگرفتێکی سیاسیو کۆمەڵایەتی تازە لەهەر لایەك بێت هاتەئاراوە .. بە کورتی نابێت : بەچاوێك بە ( هەمانچاو ) بەچاوەکەی جاران سەیری کێشە کۆمەڵایەتیەکان بکەینو موعادەلە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکەیی بۆ ڕێك‌خەین ..!

لەڕاستیدا مستر ( سی . جی . ئەدموندز ) لەم ڕووەوە زۆر سودی لەم پەیڕەوە ( القاعدة ) وەرگرتوە ..، بەڵام بەپێچەوانەی سودی کۆمەڵانی خەڵکەوە تێکرا و ( هەقە )کان بەتایبەتی ، بۆیە هەر لەوساوە ، ترساوە کە بە هاتنەپێشەوەی چەند کارەساتێکی نوێ‌ی‌تری

کۆمەڵایەتی‌یەوە کە لەتواناو ڕکێفی خۆیدا نی‌یە کارێکی وەها بکەن ئەمیش نابوت بێت‌و لێ بقەومێت ، و ( سەگ شوانی پێکەوە بێتەوە ) ، بۆیە هەر لەو وەختەوە ( بنە )بۆ سیاسەتی : ( بەرت‌کەوسەرکەوە = فرق تسد ) دادەنێت ..!

مستر ( ئەدموندز )یش بە پێی پێداویستی ( الضروریات ) ئەرکی فەرمان ڕەوایەتیە کەی ،دەزانێت لە مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی وەکو وەکو مەسەلەی ( هەقەکان )دا کە لە دەم‌ودووی ( شێخە )کەیانەوە ـ خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ـ وە هەندێ ( حیکمەتی دنیایی ) تێدا دیوە ! لەکاروبارێکی وەها ئاڵۆزو ناسکدا بڕیاردان شتێکی ئاسان نی‌یە بۆیە تۆزێك بەشی ئەو سەرو بەشی (ئاشتی )تێدا دەهێڵێتەوە ، و تەواو شوڵی لێ هەڵناکێشێت ، گێرەشێوێنیەکە بەکەسانی‌تر دەسپێرێت‌و ( خەتاسورێ لە خۆم دوورێ ..! ) دەڵێت : بۆمیری مەترسیان نی‌یە ..و کردنەوەی قوتابخانە دەکات بە چارەسەری کێشەو بەرەکەیان ..! لاپەڕە ( ١٨٧ )کتێبی ( کرد ، ترك ، و عرب ) دانەری « ئەدموندز » .

لە بەرئەوەی کە مەسەلەی کۆمەڵایەتی هەر تەنها بریتی نی‌یە ، لە لایەنێکی تایبەتی لە چالاکی ئادەمیزاد ، بەڵکو ئەنجامی کۆمەڵێکە لە چالاکی ئابوری‌و بیروباوەڕو پەیوەندیەکانی ناوکۆمەڵگە (Social Relations) ئەو پەیوەندایەتیانەی کە کۆمەڵگەی پێوە بەندەی لەسەری دروست بوە (Social Structure) ، و ئەوپەیوەندایەتیانەی کە گۆڕاوەو لەگۆڕاندایە ، بە درێژایی تەمەنی ئەو کۆمەڵگەیە .. بە درێژایی ماوەی سوڕانەوەی کورەی ئەرز بە دەوری خۆیداو بەرامبەر بە ڕۆژ .. هتد ئەو گۆڕانانە کە وا کەم‌و زۆر کار لە ویژدان‌و دەروون‌و

شێوازی بیر کردنەوەی هەمو کەس‌و ئەندامێکی ئەو کۆمەڵگەیەو ، کۆمەڵگەی ناوبرا دەکەن ••• بریتیە لە گەلێك چالاکی ئاڵۆسکاو تێکەڵ‌و پێکەڵ‌و ئاڵۆز ، لەو باوەڕەدا نیم کە «تاکە کلیلێك» هەبێت بۆ هەمو قفڵەکانی بشێت‌و بتوانێت بیان‌کاتەوەو ئەو هەمو ئاڵۆسکاوی‌و گرێ‌و لچکەی پێ بکرێتەوە ••• هتد وەیا ڕەچەتەیەکی تایبەکاری هەبێت بۆ هەمو دەردو مەینەتیەکانی بشێت‌و چارەسەری بکات ••!

بەڵام شێوازەکەی مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) کلیلێکە قفڵی گێرەشێوێنی‌و ئاژاوەو ئاشوب‌و خوێن ڕشتن دەکاتەوە ••! ڕەچەتەیەکە بە کەڵکی دەردەسەری و سەر ئێشەکەی ( الصداع ) خۆیان دێت‌و پەس ـ گەرچی بۆ ماوەیەکیش بێت ـ ، بەڵام قفڵەکانی‌تر کە پەیوەندیان بە ژیان‌و گوزەرانی خەڵکەوە هەیە ، ژیانێك کە شایانی ئادەمیزاد بێت لایەقی ئەو زیندەوەرە ( دووپێ )یە بێت ، کە داهێنەرو دروستکەری هەمو خێروبێرێکی سەر زەویە ، ئەو زیندەوەرەڵ کە بەرەو ئاسمان چوەو بە ناخی ئەرزدا چۆتە خوارەوە ••! ئەو زیندەوەرەی کەوا بە (تەن‌و لەش )یش گەیشتۆتە مانگ ••، نازانم بوێرم بڵێم ئەو زیندەوەری کە پیروپێغەمبەران ( لەوە )و بۆ ( ئەوە ) ••!! ئەم کلیلەیان لای کۆمەڵانی خەڵك خۆیانە بۆ کاتێکە کە ئەو کۆمەڵانی خەڵکە ڕێ‌و ڕێبازی ژیان‌و گوزەرانی خۆیان بزانن‌و گومڕا نەبن ••، بە کورتی لە تەجروبەو تاقی‌کردنەوەیانە وە فێر بن‌و شارەزا بن ، ڕەش‌و بۆر ، دۆست‌و دوژمن لەناو خۆیاندا جیا کەنەوە دۆست‌و دوژمنی ژیان‌و گوزەراینان بناسن •• ئەوسا بە کلیلی ناسین‌و زانین دەرگای ژیان‌و گوزەرانیان بۆ دەکەوێتە سەرگازی پشت •••!

بەڵام مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) سنگێکەو دەی لەقێنێت ••!

شتێـکه ڕەگ‌و ڕیشەی لەناو خەڵـکەکەو کۆمەڵـگەکە خۆیدایەو پێیان دەفرۆشێتەوە ..، ئیتر تاڵ‌و کرمێی لەسەر خۆیان‌و ئۆباڵی بە ئەسـتۆی خۆیان ..! بۆیە هەر لەسەتاوە هەوڵی داوە شان‌بەشانی تۆمەتەکانی کـــە ( ئاراستیی ( هەقە )کانی دەکات ناڵێم ( سیاسەت ) بەڵـکو دەڵێم ڕەوشت‌و کردەوەی ( پەرت‌کەوسەرکەوە )یان لەگەڵدا بەکار بێنێت ..، تا بیان‌کات بە ئاردی ناو دڕکان .! خۆیان خۆیان بخۆنەوە ! گەرچی بەم ڕەوشت‌و شێوازەی تا ماوەیەك سەرکەوتـن یاور یاوەرێتی بــەڵام سەرکەوتنێـکی « وەختی » بۆ ئەمیش وەیا بۆ « ئەمانیش » هیچی تێ ناچێت .. ڕۆنـــی خۆیان دەداتەوە لەسەری خۆیان ..، سەرکەوتێـکە جێی ئومێد نی‌یە ، پشتی پێ نابەسترێت ..! چونکە ( ماك‌و چەکەرەی ) کێشەکۆمەڵایەتی ـ ئابوریەکە ، کەوا ( هەقە )کان وەکو لەپێشەوە وترا ئاوێتەی ڕێبازەکـەی خۆیانیان کردبو ، لەناو کۆمەڵـگە کەدا هەرماوە ..، ڕۆژ کۆڕو کۆمەڵی تریش با بەشێوازێـکی جیاوازیش بێت ـ دەخاتــە ســەوداو ئەندێشــەی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە ، واتە لەم ڕووەوە ، زیاتر ئاوەڵ‌و هاوڕێ بۆ ( هەقە )کان پەیدا دەبێت ، گەرچی لە بنەڕەت‌و بۆچون‌و چۆنێتی (الکیفیة) چارەسەرکردنی ئەم کێشانەدا ، لە توندو تیژی شێوازدا ، لەوانەیە کـــە ( هەقە )کان لە چاویاندا بەحەوت ئاو شۆرابنەوە ..!

لەپێشەوە وتمان کە مستر ( سیسل . جـون . ئەدمونـدز ) چـاوی گێڕاوە لەخزم‌و خوێشانی خوالێ‌خۆشبو ( شیخ عبدالکریـم )ی شەدەڵـە ( بنە )یەك دانێت بـۆ کردارە پەسندەکـەی لەمەڕخۆیـان ـ کـرداری ( پەرت‌کەو سەرکەوە ) ـ ئـەم چاو گێـڕان‌و لەدەمەوەدانـەو هـەوڵ‌و تەقەلایەی بە خۆڕایی‌و بێ‌سود نی‌یە بۆ ئەومەبەسە دورەی کە هەیەتی‌و بە تە مایەتی بەرامبەر بە (هەقە)کان کەیرتیبەلە : ١ـ کەرت‌و پەرت‌کردنی ( هەقە )کان ولاواز کردنیان‌و لاوازکردنی ئەو مەترسیەش کە لەمانـــەوە

پەیدا دەبێت ـ کـــە هاوبەشێتیو تـەباییو یەکسانێتیەکـــەیانە ـ ••،
٢ ـ لەکەدارکردنی ئەو بەرەیەش لە شێخانی سەربە ( هەقە ) کـــە وا لەسەرکردایەتیەکەیانەوە زۆر نزیکە ، بە نزیك کردنەوەیان لەخۆیو دامو دەزگاکەی خۆی ، کـە ئـەم دەستکاریـە ئەنجامێـکی کوشـندەی دەبێت بەنیسبەت ( هەقە )کانەوە تێـکرا ، چونکە ئـەو بەرەیـەی کە لەمـەوە نزیکە دەکەوێتە داوییەوە ، قەرزداری دەستیاوێتی بەسەریـەوە ، ئیتـر دەبێت ئەو قەرزە ، ئەو کاسە ئاردە لەسەربەسـتیو ئازادیەکـەی خـۆی بداتەوە بەو ••! سەرەڕای کە ئەم دەست تێوەدانەی ، دەست وەشاندنێکە ڕاســتەو خۆ لـــە سەرۆکایەتیو لەپێشەوایەتیەکـــەیان ، بـــە واتەیەکـــیتر ناوجـەرگەو ( مەرکەزیەتەکەیـان ) دەگرێتـەوە ، چ بـۆ ( هەقە )کانو چ بۆهەر ڕێـکخراوێك کۆمەڵایەتی بێت یا سیاسی ، لـــە بنەڕەتەوە هەڵی دەتەکێنێت •• دەبا تۆزێـکیش سەیرێـکی ئەم شـێوازو ڕێبازە بکەین ، نەختێك لێی وردبینەوە ، تاکو بەدەمـی ( ئەو ) کەسانـی بێخەتا ، تاوانبار نەکرێت ، و لەکەدار نـەبێت ، تـەڕو ، وشـك پێکـەوە نەسوتی ، لەنەشارەزاییە وە مەبەسەکەی ( ئـەو ) بێتـەدی ، کـە ئەمـە یارمەتدانێکە ، وەیا بون بە پردو بەردەبازێـکە بۆ پەڕینـەوەی بیـروڕاو پیلانەکانیان بە بەلاشیو بە خۆڕایی •• !

مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) لە کتێبەکەیدا ( کرد ، ترك وعرب ) وەکو خۆی دەیڵێت : ١ ـ پۆلیس لە ڕەوشتی ( هەقـە )کـان ئاگـاداریان کردوەو ( افادە )یان داوە ••• هتد •

ب ـ بازرگانە بەڕێزەکانی توتن بێزاریان دەربڕیـوە ، لای میـری شکاتیان لێ کردون بون بە شایەتی ئەو بەسەر ( هەقە )کانەوە • دیارە لەم ئاوو هەوایەدا ( مناخ ) هەڵبەتـە ( مضـبط ) یەکـی چـل کـەسیشیان

لێ کراوەتەوە ••• هتد کەوابو پێشەکیەك ساز بوەو هاتۆتە ئـاراوە ، ئـەو پێشەکیەی کەڕاستەو خۆ ، یا لابە لا (دەستودەمی) ئەم وەیا (ئەمانی) تێدابوە ، وە کوپێشتر باسکرا ••!! ئیتر ( ئەم ) وەیا مستر ( سی • جـی ئەدمونـدز ) کـە ئـەو بەڵـگەو نیشانە ( خـۆ کردانـەی خۆیی !! ) لا ئەدمۆندز ) کـــەئەو بەڵـگە نیشانـــە ( خۆکردانـەی خۆیی !! ) لا کۆدەبێتەوە ئنجا پێویستە لەسەری بجوڵێت ، چونکە نوێنەرێـکی بـەرزی حوکومەتێـکی داگیر کەرە لە وەزارەتی ناوخـۆی وڵاتێـکی داگیـــر کراودا ، هەمو تەماشای دەمی ئەم دەکەن ••! کـــە دەبێــت ( شخصـیا ) لەشوێنی کارەسات (محل الحادثة) ئامادە بێت‌و ئاگاداری ئەم مەسەلەیـــە بێت ، بۆ چارەسەرکردنی بە پیری‌یەوە بچێت ! چونکە قۆناغی فسك‌و هوڕو جرت‌وفرتی پیلان دانان بە ئەنجام گەیشت ، ئیتر مەسەلەکە ، کەوتە بارێـکی‌ترەوە ••!! کە دەبێت لەم بارەیاندا، لەم مەڵبەندەیاندا چارەسەر بکرێت ، کە ئەمیش باری یاسایی‌و قانونی‌یە ، کەوا میـری یاســـەوان‌و پارێزەرێنی ••• هتد بۆیە مستر ( سی • جی ئەدمونـدز ) هـەڵدەستێت دیدەنی‌یەکی خوالێ‌خوشبو ( شیخ عبدالکریم )ی‌شەدەڵە دەکات ، لەماڵ‌و خانەقاکەیدا گفت‌وگۆی لەگەڵدا دەکـــات •• ( حیکمەتێـکی دنیـایی ) لەفەرمایشەکانی ( شیخ )دا ، دەدۆزێتـەوە •• ئیتر ئـەوەنـدە ناخایەنێت خوالێ‌خۆشبوان ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەو ( حاجی شێخ عارف )ی سەرگەڵو دەگیرێن ، ئیتر میری دەکەوێتە ڕاوو دوونانیان ••• هتـد ئەم کەین‌و بەینە یەکسەر دوای دیدەنی‌و چاوپێ کەوتنەکەی ( ئەدموندز ) بە ( شیخ عبدالکریم ) دەست پێ‌دەکات ••!

لێـرەدا پرسیارێك قوت دەبێتـەوەو دێتـە پێشەوە ••، بۆچی مستر ( ئەدموندز ) ئەوەندە بێ لوتفە لەگەڵیاندا ••!؟ ئایا هیچ شێوازێـــکی ( اسلوب ) دەم‌لووسی‌و دیبلوماسی ئەوتۆی نەبو کە لەئەرکی ئەم گرتن‌و

بردنە چ لەسەرشێخانی ( هەقە )وچ لەسەر میریش کەم کاتەوە لە کاتێکدا کە ئەم فەرمان ڕەوایەکی بەرزو گەورەبو ، دام‌و دەزگای وەزارەتــی ناوخۆکەی ئەو میریەدا ..، وەیا کارێکی وەها بکردایە ، باری هیچ نەبێت ( شێخە )کانیان بکات بە ئەنگوستیلەو بیان کاتە پەنجەی خۆیەوە ..!؟بەش بەحاڵــی خۆم لەو باوەڕەدام کــە ( ئەدمۆنــدز ) لــەم ڕووەوە هەرگیــز کەمتەرخەم نەبوەو دریغی نەکردوە ! چوونەکەی بۆ شەدەڵە بۆ خزمەت ( شیخ ئبدالکریم ) نیشانەیەکی زەقی چالاکی‌و لێهاتوویی بــوە ، بــۆ بەرژەوەندی فەرمانڕەوایەتیەکەی ..! بەڵام وا دیارە کە خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەی بۆ نەرم نەکراوەو نەخوساوە ، بە کورتی ( شێخ )ی بۆ ( تاو ) نەکراوە ! لەگەڵ تەواوی ڕێزمدا بۆ ئەم زاتە ، کــە ئەم وشەیە لایەقی ئەو نی‌یە .. بەڵام دەقاودەق شایانی ئەم جۆرە مامەڵەیەو کردەوەیەیە ، مایە شانازیشە بۆ خوالێخۆشــبو ( شــیخ عبدالکریــم )ی شەدەڵە ، چونکە مستر ( ئەدموندز )نەیتوانیوە هەڵی فریوێنێ‌و لاســـی بدات ..! بێ‌گومان ئەم پێشنیاری هەبوە بەڵام ( شێخ )قوبوڵی نەکردوەو دەستی ناوە بە ڕوویەوە بۆیە بەو جۆرە لە (هەقە)و شێخانی سەربە (هەقە) بە قین‌داچوە ! ئەوی پێ‌ی و توون ، پێ‌ی‌و توون ( ل١٨٧ ) کتێبەکــەی ئەدموندز ( کرد ، ترك ، عرب ) .. ئنجا ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی کە بــــە هەزارویەك پەت پابەندی ئەم‌و جڵەوی کاریان بە دەست ئەمــەوە بــوە ، بەڕووپامایی دەهاتن قسەکانی ئەمیان دەقۆستەوە بە ( هەقــە )کانیـــان دەوتەوە...تەنانەت بۆ ئافەرین لە لایەن ئەمەوەو ڕەزامەندی (سڵاو)یشیان دەدایەوە ..! ئەمە هەموی سەبارەت بە فەرمان ڕەوایەتیەکەی ، کــــە وا لەبەڕێوەبردنی کاروباردا ( بەخشیش )و بەخشندەیی ( الکرم )و خەڵات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی‌و جێ‌بەجێ‌کردنــی گیــرو گرفتــی فەرمانــە پێداویستیەکانی ( الاوامر الضرورية ) فەرمانڕەوایەتی‌و فریودان‌و لــــە

خشتەبردن ... هتد ، هەروەها لـە ڕووی کۆمەڵایەتـیو درەوشـانەوەو بریسكوهوڕی دەسەڵاتو گـەورەیی نـاو کۆمەڵـگەو ( سـەرداریو سەروەریە ) کەیەوە لە وڵاتی دواکەوتودا ئـەم بەخشیشـو بەخشندەیە دەورێـکی سەیرو ئەفسوناوی هەیە ..!

ئیتر مستر ( ئەدموندز ) لەکتێبەکەیدا بۆیە خوالێخۆشبو ( حاجـی شیخ عارف )ی سەرگەڵو دەکات بەداهێنەری ( هەقە )یەتی ...، تا بیکات بەگورزی دەستیخۆیو بەربەرەکانی خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەی پێبکاتو بە ( حاجی شێخ عارف ) هەڕەشە لەمبکات .. واتـە یا ( شێخ عبدالکریم ) ئەگەر لەگەڵماندانەبێت ، لەخۆمان نەبێت لە جێگەی تۆهەیە ..! بەڵام لە ( دەمەوەدانی ) خوالێخۆشبو ( حاجی شێخ عارف ) بەم شێوەیەو یەوەبەسە بەکاکڵو توێکڵەوە دەغەڵیوناپاکیە ..! تەنانەت ( حاجی شێخ عارف ) خۆیشـی ئەمقسـەیەی ( ئەدمونـدز ) دەخاتـە پشـتگوێیو بەلایـدا ناچێـت ...، ئەگینـە لەگـەڵ خوالێخۆشـبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەدا بەجوت نەدەگیرانو ڕاوودوو نەدەنران..!

هەرچەندە خۆم ئەم زاتەم نەدیوەو بەخزمەتی نەگەیشـتوم ، بـەڵام ئەوانەی کەدیویانەو پرسیارم لێکردون تێـکڕا باسـی باشـیو ژیـریو دورئەندیشی خوالێخۆشبو ( حاجی شـیخ عـارف ) یانکـردوە کەئەمـە شایەتیەکی دەماودەم ( تواتر )و جێی باوەڕو شایانی ستایشو ڕێزە بـۆ ئەمزاتە .. !

خوالێخۆشبو ( حاجی شێخ عارف )و یستویەتی لەگۆشـەنشینو وکەنارگیریەوە ، بەهۆی ئەرزو ئاوەوە ، گوزەرانێـکی هـەبێت .. وا دیارە حەزی نەکردوە کەخۆی توشی سەرئێشەو گێژاوی ( ارشاد )و گەڕوگێچەڵی مریدومەنسوبو مەحسوب بکات ..! ئەگینە لەم ڕووەوە ،

دەبوایە جێدەستی چالاکیەکی دیاربوایە ..! خۆ ئەگـەر بەربەرەکانی خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەی بکردایە ، وەیا هەڵوێستێکی ناحەزانەی هەبوایە بەرامبەری لە بابەت سەرکردایەتی کردنی (هەقە)وە ، ئەو دێهاتانەی کەلەو ناوچەیەدا لەژێر دەستیدا بو وەکو : (قۆمرغان ، و قەرانگوێ ، و تۆپزاوا ، و حاجیتان ) کەدانیشتوانی ( هەقە )بونو سەربە ( شیخ عبدالکریم ) دووچاری کێشمەیەکی ئێجگار زۆر دەبو ، لەگەڵیاندا ، وئیشو کاریشی پەکی دەکەوت .. ئەمە لەلایەن ، لەلایەکیترەوە کەئەم لایەنەی زۆرگرنگەو بایەخێـکی تایبەتی هەیەو گەلێك مانا دە بەخشێت ! بەربەرەکانی کردنی خوالێخۆشبو ( شـــیخ عبدالکریـم )ی شەدەڵـە ، لەمەسەلەی سەرکردایەتی کردنی ( هەقە )دا ، بەم بەربەرەکانیە زیاتـر لەمستر ( ئەدمونـدز )و دامودەزگاکە پێ نزیك دەکردەوە ، بۆ پاریزگاری خۆی لەم بارودۆخەیدا ، ئەوان دەبونە پشتوپشتیوان بـۆی و ئـەمیش بەناچاری هانای بۆ ئەوان دەهێنا ، کـەئەم بارەی بـۆ ئایندەوپاشـەڕۆژی شایانی ستایشو جێی شانازی نەدەبو بۆی ...! خۆ ئەگەر خوالێخۆشبو ( حاجی شیخ عارف ) دوای قسەی مسـتر ( ئەدمونـدز ) بکەوتایـە ، چارەنوسی خۆیو کوڕەکانیشی لەچارەنوسی ( قانگەلاژك ) بە دەمباوە باشتر نەدەبو ..! بۆیە دورەپەرێزی یەکەی لەسەرکردایەتی کردنـی ( هەقە )و ( هەقەیەتـی )بـە هـەرچ بیانوویەکـەوە بوبێـت ... دوورئەندێشیەكو ژیری یەکی تێدابوە ، ئیتر هەرلەوساوە ، کوڕەکانیشی یەکەسابەتەوە خەریك بـونو بەئیجـارە گرتـنی جۆگـەی « چـالاغ » لەسەرچەمی ( تابین ) ، و توخونی هیچ قۆمیتەو قومیتەکاریەکی دژ بـە سەرکردایەتی ( هەقە ) ،و هیتر نەکەوتون ، بەهێمنی ژیاون تا نوسینی ئەم چەندێرەش .. !

## ( ٩ )

لەساڵی ١٩٢٧ز کەیەکەم بیری نەوت لەم وڵاتەدا لەلایـەن گەلـە کومپانیەکـانی (I.P.C.) وە هەڵـکەندراوەو لـەڕووی بازرگانیەوە ( نەوتە )کە نرخو بایەخێـکی پەیدا کردوە ، پێش ئەم سەردەمەش بـە نیو چەرخ ـ ئەگەر چەرخێك صەدساڵ بێت ـ ئەم وڵاتو ناوچەیە کـــە لەڕووی جوغرافیاوە لای ئەوروپاییەکان بە (Mesopotamia) میزۆپۆتامیا ، واتە دۆڵی دووڕووبارەکە = ( وادی الرافدین ) بەناوبانگە سەرنجی گەشتیارە ئەوروپاییەکانی ڕاکێشـاوە .. بەگەلێـك نـاوەوە ، تەنانەت بەبەرگ‌و مێژەری ئاینی خەڵـکەکەیـەوە ! هاتون گوایـا بـــۆ پشکنین‌و لێکۆڵینەوە ، و دۆزینەوە .، ئەمە لەکاتێـکدا کەوریابونەوەکەی میللەتانی ئەوروپا ، ئەنجامێکـــی سروشتی ، بۆ ئەو شۆڕشەزانیاریانە یە، کەپێش ئەم بە چەند چەرخێك ئەو میللەتانەی خستبوە سەر ڕێبازی زانین بەهۆی لێـکۆڵینەوەو پشکنینەوە ، کە بەڕووخانی ڕژێمی دەربەگی ، و پەیدابونی ڕژێمی سەرمایەداری لە ئەوروپادا دەستی پێ‌کـرد .. لـــە ڕاستیدا ئەوی پێویستە بوترێت ڕژێمی سەرمایەداری لەسەرەتایدا بـــۆ گەشەکردنی ، پشتی بە زانیاری دەبەست ، ئەمە پێش ئەوەی بگاتە پلەی ئەمڕۆی کەوا ئیمپریالیزم وەیا « ئیستیعمارە » ..! هەرچەنـدە هـەوڵ‌و

تەقەلا ، لە ڕووی دۆزینەوە ، و لێکۆڵینەوەو شارەزاییو شارستانێتییەوە ( الحضارة ) لە هەرلایەکو لەهەر لایەنێکەوە بێت کارێکی پیرۆزو باشە لەم مەیدانەدا ، گەشتیارە ئینگلیزەکان پێشەنگی کاروانی ئەم گەشتیارانە بون ••• سەبارەت بەوەی ، کە میللەتی ئینگلیز لەپێش هەمو میللەتەکانی تری ئەوروپادا ، هەر لەسەدەمی ( ڕۆجرِبیکن ) ەوە کەوتنە سەرباری تەجروبەو تاقی کردنەوە ، و پشکنینو دۆزینەوە ئیتر بونە پێشرەوو کراس سوری بەر لەشکری ڕژێمی سەرمایەداریو ، وەستاو بلیمەت تیایدا •• تەنانەت بونە تەڕاوێژ پێکراوی یاسایی ( مستشار قانونی (Legal Adviser) بۆ هەمو ڕژیمێکی سەرمایەداری لەهەر لایەك بێت ••!

بێ چەندوچون ، ئەگەر زانینو زانیاریو شارەزایی بەپێچەوانەی خێروخۆشی وەیا گۆڕانو پێشکەوتنی کۆمەڵانی خەڵکەوە بەکارهێنرا ، وەیاخود خرایە پێناوو پاراستنی مەبەستێکی تایبەتیەوە ••! ئەوسا دەبێتە هۆی مەینەتیو کوڵۆڵی بۆ کۆمەڵانی خەڵك •• وەکو پزیشکێك کەزانیاریە پزیشکایەتیەکەی خۆی (Medical Sciences) تەنها بۆ بونو دەوڵەمەندی ! تەرخان کاتو بەکار بهێنێت وبیکات ، دەستمایە بۆ ئەم مەبەسە •! دیارە لەم بارەدا « قازانج سەری مایە دەخوات » زانیاریەکەش سوكو ڕسوا رەبێت •• لەم ڕەووە یەکێك لە زانایان و تویەتی : (بیردۆزە ئەندازیاریەکانیش « النظريات الهندسية » ئەگەر چاکەی مرۆڤو خەڵکی تێدا نەبوایە ، و بەکەڵکی کەس نەهاتایە ، هەرگیز خەڵکی ئەو بیردۆزانەیان نەدەسەلماندو دەیان گۆڕین ••! ) بۆیە شتێکی سەیر نییە کەوا جموجوڵو چالاکی ئەو گەشتیارو پشکنیارانە زانینو شارەزاییەکەیان لای خەڵکی وڵاتەکەو ( خانەخوێ ) ! جێی گومان

سڵ کردنەوە بێت ، تەنانەت لەگەڵێك (لا) هەندێکیان چارەنوسێکی پەستو غەمناکیان هەبوە ..!

با لەبابەتەکەمان زۆر دوور نەکەوینەوە ، چونکە بەلای منەوە ـ گەرچی لەهەقەو هەقەیەتێدا (لا)نیمو لەوان نیم ، تەنها بۆ مشتوماڵ کردنی ڕاستیو حەقیقەت ، ئەم مشتومڕە دەکەم ، دیسانەوە بەپێداویستی سەرشانی هەمو ڕۆشنبیرێکی دەزانم کە دەبێ بەرامبەر بەو کارەساتانەی کەلەنزیکیەوە ڕوو دەدات بیروڕایەکی ڕاستو دروستی هەبێت لە ئاستی تاکو : أ ـ نەبێتە نێچیرێکی دوودڵیو ڕاڕایی .. ب ـ واتەی ناحەزو دوژمنی هەمولایەك بەڕاست نەزانێت ..! ئنجا بینا لەسەر ئەم دوانە بڕیار بدات ، دیارە ئەنجامەکەش ، بۆ ڕۆشنبیریتی ( الثقافة ) شێواندنو تێکدانە ، وە بۆ ڕۆشنبیرەکەش ( المثقف ) لەگەڵ مەڕدا شێوەنو لەگەڵ گورگدا شایی کردنە ..!!

ئیتر ئەو قسەو قسەلۆکەش ، کە دوای ( هەقە )کان خراوە ، ئەو تەقو تۆقەی لەمان کراوە ، ئەو ڕاوەنانو ئازارەی کەوا ئەمان چەشتویانەو بەسەریان هاتوە .. هتد ـ دڵیان لە خۆیاندا نەمێنێ .! ـ بەشێکە هەمووی نییە ، لەو کێشەو بەرەیە ، کەلە پێناوی مەسەلە سەرەکیەکەدا هەمو میللەتی گرتبووەوە ، و ئاوقای هەموو هاونیشتمانیەکی دڵسۆز بوبو ، بە کورتی : سزابو ، تۆڵەبو ، ( تۆڵە )ی ئەڵقە لەگوێ نەبونو (کوڕنوش) نەکردن ، لەڕێڕەوی مەسەلە سەرەکیەدا ، کەوا گشت شارەزاییو چەلاکی گەشتیارە ئینگلیزەکانو پسپۆڕەکانیانی سەرجەم بەرەو ڕوو کرابووەوە ، بەمستر ( سی . جی . ئەدموندز )یشمەوە ، هەمو لەخزمەتو پێناویدا بون .. لە پێناوی ئەو « بیرەنەوتانە »دا کەوا کانگای سامانێکی بێ شومار بونو خرابونە ژێر چەپۆڵەی گەلە کومپانیەکانی نەوت ، بۆ

دەرهێنانی و کێشەوەکردنیئەم سامانە بەتاڵانی ! بۆ سودی مشتێك لە بازرگانانی ئەم پیشەسازیە ـ پیشەسازی دەرهێنانی نەوتو پاڵاوتنی ـ لە پێناوی پاراستنی ئەم بەرژەوەندیە چەورەو ••! لە هۆشیار بونەوەو ( وریا ) بونەوەی خەڵکی وڵاتەکەو خێر نەبینین لەم سامانەیان ••!

ئنجا دروستە ئەگەر بڵێم : تێکوشانی خەڵکی وڵاتەکەو نیشتمانپەروەرانو ئازادیخوازانی تێکرا ، ئەوەندەی بەرمیلی نەوتی کێشەوەکراو •• ئەوەندە بەرمیلە فرمێسكو خوێنی پێوە بوە ••! چیرۆکی ئەشکنجەو ئازاریش لەم ڕێڕەوەدا بوە بە ( بەیتی بلە ! ) ناڵێم هەر کۆتایی نایەت ••، بەڵام دەخایەنێت ••! ئەمە نەك هەر لێرە هەیە•• بەڵکو لە هەمو ئەو وڵاتانەدا کە بۆنی نەوت وەیا بۆنی هەر سامانێکی تری چەوری لێ دێت ، هەمان ئاش بەفرمێسكو خوێنی خەڵکەکەیو هاونیشتمانیانی لە کاردایەو دەگەڕێت ! گەرچی ڕێبازو شێواز ، جیاوازیش بن بەڵام ئامانجو مەبەس هەر یەکە ••!

لەم بارو دۆخەدا مەسەلە کومەڵایەتیەکە ، و هتد دەخرێتە بریتی ( سیاسە ) تەوە ! **سیاسەتیش** لەپێناوەو خزمەتی ئابوریو ( اقتصاد )دایە ، بێگومان ئەمیش دەستیاوی ! بەسەر سیاسەتەوە هەیە ، دەبێت پاداشی بداتەوە ، واتە ئەمیش یەعنی ئابوریو ( اقتصاد ) دەبێت لەپێناوو خزمەتی سیاسەتدا بێت •• کوردواتەنی : ( هەمو ڕێگەیەك بۆ « بانە » دەچێت •!) واتە هەمو ڕێباز و شێوازەکان لە سیاسەتدا یەكدەگرێتەوە ، و دەچێتەوە بۆ سیاسەت •• ئنجا ئەوی وێلی ڕەواو ناڕەوایە ، وەیا هەقو ناهەقەو بەدوایدا دەگەڕێت تەواو ماندوو ، چەواشە دەبێت ••، تا دەیگاتیو پێی شاد دەبێت ـ لەم ڕێڕەوەدا ـ توشی گێرەو کێشەیەکی بێ ئەندازە دەبێت ••! ئەم کێشەو بەرەیە کوتومت لە چیرۆكو تەلیسمی ( قەڵایچەی

دەرهێنانی و کێشەوەکردنی ئەم سامانە بەتالآنی ! بۆ سودی مشتێك لـــە بازرگانانی ئەم پیشەسازیە ـ پیشەسازی دەرهێنانی نەوتو پالاوتنی ـ لە پێناوی پاراستنی ئەم بەرژەوەندیە چـەورەو ••! لە هۆشـیار بونـەوەو ( وریا ) بونەوەی خەڵکی ولآتەکەو خێر نەبینین لەم سامانەیان ••!

ئنجا دروستە ئەگەر بڵێم : تێـکوشـانی خەڵـکی ولآتەکـەو نیشتمانپەروەرانو ئازادیخوازانی تێـکرا ، ئەوەندەی بەرمیلی نەوتـی کێشەوەکراو •• ئەوەندە بەرمیلە فرمێسـكو خوێنـی پێـوە بـوە ••! چیرۆکی ئەشکنجو ئازاریش لەم ڕێڕەوەدا بوە بە ( بەیتی بلە ! ) ناڵێـم هەر کۆتایی نایەت ••، بەڵام دەخایەنێت ••! ئەمە نەك هەر لێرە هەیە•• بەڵکو لە هەمو ئەو ولآتانەدا کە بۆنی نەوت وەیا بۆنی هەر سامانێـکی تری چەوری لێ دێت ، هەمان ئاشـی بەفرمێسـكو خوێنـی خەڵـکەکەیو هاونیشتمانیانی لە کاردایەو دەگەرێت ! گەرچی ڕێبازو شێواز ، جیاوازیش بن بەڵام ئامانجو مەبەس هەر یەکە ••!

لەم بارو دۆخەدا مەسەلە کومەڵایەتیەکە ، و هتد دەخرێتـە بریتـی ( سیاسە ) تەوە ! سیاسەتیش لەپێناوەو خزمەتی ئابوریو ( اقتصاد )دایە ، بێگومان ئەمیش دەستیاوی ! بەسەر سیاسـەتەوە هەیـە ، دەبێـت پاداشی بداتەوە ، واتە ئەمیش یەعنی ئابوریو ( اقتصاد ) دەبێت لەپێناوو خزمەتی سیاسەتدا بێت •• کوردواتەنی : ( هەمو ڕێـگەیەك بۆ « بانە » دەچێت •!) واتە هەمو ڕێباز و شێوازەکان لە سیاسەتدا یەكدەگرێتەوە ، و دەچێتەوە بۆ سیاسەت •• ئنجا ئەوی وێڵی ڕەواو ناڕەوایە ، وەیـا هـــەقو ناهەقـەو بەدوایدا دەگەڕێت تەواو ماندوو ، چەواشە دەبێت ••، تا دەی گاتێو پێی شاد دەبێت ـ لەم ڕێڕەوەدا ـ توشی گێرەو کێشـەیەکی بـێ ئەنـدازە دەبێت ••! ئەم کێشەو بەرەیە کوتومت لە چیرۆكو تەلیسمی ( قەڵایچەی

ڕاخستوەو سـوالّ دەکـەن ... فەرمـانڕەواکە دەپرسێت ئەمـانە چکارەن ؟! یارویاوەرەکانی وەلاّمـی دەدەنـەوە دەلّێـن : ئـەم دووانە زۆردەمێـکە لەم شوێنەدا سوالّ دەکەنو برایەتیان زۆر خۆشە موو بـە بەینیاندا ناچێت .! ئێواران کە ڕۆیشتنەوە ، هەرچیەکی دەستیان کەوتبێت، بە یەکسانیو بەتەبایی وەکو برا بەشی دەکەن .. ئنجا فەرمانڕەواکـە ئەمە دەزانێت لێیان نزیك دەبێتەوە پارەیەکیان بۆ فڕی دەداتە ناو دەستە سڕەکەیانەوە بە دەنگی بەرز دەلّێت : ( ها ئەمە لێرەیـەك ..! ) ئێـواری کە دەڕۆنەوە ، وەکو جاران حیسابی دەسـتکەوت بکەنو بەشـی بکـەن (لێرە)کەی تێدانییە ، لەیەکتری دەکەونە گومانەوەو دەبێتە مشتومڕیان بەگژ یەکدا دەچن ..!! بۆ بەیانـی لەبەر دەرکـی مزگەوتەکـە بـە لێوولووتی ئاوساوو ناوچەوانی هەلّتۆقیوو لەشولاری بریندار بە پـلاری کوێری ..، دەیانبینن ! هەریەکەیان ڕووی کردوتە لایەكو پشت لـە هاوڕێی جارانی غەمبارو کزومات دانیشتون ..!

تاکو چۆنێتی کۆششەکە بۆخوێنەری بەڕێز پتـر ڕوون کەینـەوە ، کەوا چۆن چلّێسی و چاوچنۆکـی ، وەیـا بـارە نالەبارەکـەی لەمـەڕ ( سیاسەتی اقتصاد )و ئابووریلەلایەن بێـگانەی داگیر کەرەوە لەناو ولاّتی داگیرکراوو دەستبەسەردا لەپشت ئەم کارەساتە کۆمەلاّیەتیانەوە خـۆی مەلاّس داوە ، بەجۆرێك کە پەنجەی تاوانو خەتا و ڕووی دەم ڕاستەوخۆ ئاڕاستەیان نەکرێت .، سەرگورشتەیەك لەگەنجینەی ژیانی کۆمەلاّیەتـی خۆمان ، دەگێڕینەوە ، کە پوختەکەشی دەماودەم بلاّوبۆنەوەو بوە بـە قسەیەکی نەستە !

دەلّێن :ـ ئۆبالّی بە ئەستۆی ئەوەی وتی ـ پیرێژنێك لە سامانی جیهاندا بۆ سەرماو سۆلّەی زستانو تەنگانەی چلەکەی کوپەلّەیەك ڕۆنی خۆمالّی

نایابی لە ترسی پیاوخراپ ، لە پشتیرەکەیاندا شاردبوویەوە ، چونکە داپیرە هەستی کردبو ، کە ( هەباس )ناوێك بە کوپەڵە ڕۆنەکەی قێر بوە ••! ئیتر بۆ ئەوەی بەسەر کەسدا نەچێت‌و کەس خەتابار نەکات ، وە بۆ دۆزینەوەی دزی ڕاستەقینەش کەوتە پیلان‌وتەگبیر ••! ئنجا هاتە پشتیرەکەو دەوروبەری کووپەڵەکەی ئاوڕشێن‌کرد •• بە جۆرێك تا بو بە قوڕێکی خەست ، سا بەشکو شوێن پێی دزەکە هەڵگرێت ••، وەیا ئەگەر دزەکە بەمەی زانی خۆی لەقەرەی کوپەڵەکەو شوێنەکەی نادات •• دیارە ئەم هەوڵ‌و تەقەلایەی داپیرە بۆ بەرگری لەسامانەکەی‌و پاراستنی شتێکی دروست‌و بەجێ‌یە !

بەڵام ( هەباس )ی چلێسی چاوچنۆك ، کە بەم کردوکۆشەی داپیرە دەزانێت ، دێت هەر لەپشتیرەکەدا سواری گوێدرێژ کەی پیرەژن دەبێت ، هەر بەسواری ئەوەوە خۆی دەگەیەنێتە ئاستی کۆپەڵەکەو چنگێکی باشی لێ دادەگرێت‌و بەسواریەوە دەگەڕێتە دواوە، کوێ‌درێژەکەش لە جێگەکەی خۆیدا دەبەستێتەوە ! دوایی داپیرە کە بەمە دەزانێت لەبەرخۆیەوە دەڵێت : ( سم سمی کەری‌و چنگ چنکی هەباسی ••• ئەمن سەرم لەم‌کارە دەماسێ ! واتە دەئاوسێ ) •

ئیتر داگیرکەری بێگانە بۆ گەیشتن بەمەبەسی خۆی‌و بەرگری‌و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ، بە تەنها خۆی پێی هەڵناسێت‌و نای‌کات • • خۆی ناخاتە بەر چاوودەم ، بەڵکو ئەم ئەرکە بە کەسانی‌تری خەڵکی ولاتەکە دەسپێرێت ، ئەو کەسانەی کە بۆ مەبەسی ئەو بشێن‌وبگونجین و لەڕووی ڕەوشت‌و خوو کردەوەوە لە هیچ شتێك باکیان نەبێت ، ئەوسا بەسواری ئەمانەوە ، بەهۆی ئەمانەوە دەگاتە ئامانجەکانی خۆی ••! تا سەر لەهاونیشتمانیانی دڵسۆز بشێوێنێت «ئەونە ناسن» ! وسەریان لە ئاستی

کارەساتەکان بماسێت ـ بتاوسێت ـ و سەرسام بن وەیا باری هیچ نەبێت ، خەڵکی وڵاتەکەو هاونیشتمانیان بەیەکتریەوە ، بەخۆیانەوە خەریك بن و شوێن پێی ئەم هەڵنەگرن و ئەم نەدۆزنەوە ، وەیا تا ئەم دەدۆزنەوە ، لەم کەشمەکەشەدا خەڵکی وڵاتەکە تەواو ماندو شەکەت دەبن ، وەلە ڕێڕەوی ئەم کەین و بەینەو زۆرانبازیەدا ، داگیرکەری بێگانە تاقمێکی باشی لەئاشناو ڕۆشناو گورزی دەست بۆ خۆی پێکەوە نساوەو پەروەردە کردوە ..! ئەوسا هاو نیشتمانیان لە هێزو تواناوە یەخەی ئەوان ناگرن ، بەڵکو لەلاوازی و زەبونیەوە بۆی دێنە مەیدان ..!

ئنجا دوای ئەوەی کەئەم بیرە نەوتانە دەرامەت و سامانیان زیادی کردو کەوتە ناوەوە ، نوێنەرو کوێخا ڕەسمیەکانی ئەم بەرژەوەندیەش لەناو دام و دەزگای ئەوسای میریدا دەسەڵاتیان پەیداکرد ، ئەگەر نەڵێین خۆیان دەسەڵاتی تەواو بون ! لەم بارودۆخەدا پێویستەدا پێویستە ئەم بیرە نەوتانە ، ئەم سەرچاوەی وزەو سامانە وەکو : « شەتڵە ڕەیحانەی ساوا .. لەچاوی بەد دووربێت » ! واتە لە چاوی خانەخۆی ، لە چاوی میللەتی وڵاتەکەو هوشیار بونەوەیە یان !! بۆیە دەبوایە خۆیان بەرگریان لە خۆیان بکردایەو خۆیان بپاراستایە ... بۆ ئەم مەبەسەش دەبێ کوێخاو گزیرو پاسەوانی جۆربەجۆر هەبن بەبەرگی سیویل و نیشتمانیەوە بە کورتی بۆ ئەم ئامانجە یا چەردەیەك لە دەرامەتی نەوتەکە نەیکات ، لابەلایان ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووی ئەوان بکرێتەوە .. وەمیریش چاوێکی لێیان بێت و دەستێك بێنێت بە شان و ملیانداو جێی لوتف و لایەنیان بێت و نازیان بکێشێت ...!! هەروەکو میکرۆبی « سیل » کە دەچێنە لەشەوە ، بۆ پارێزگاری خۆی وەکو قەڵغان و قەزاوەگیر ژەهرێك کە پێی دەڵێن : ( ئەنتی تۆکسین Anti Toxine ) بە دەوری خۆیدا دەڕێژێت ..

ئەمانیشن بەم جورە ( ئەنتی‌تۆکسین )ی خۆیانیان ڕشت ٠٠، ئاشناو ڕۆشنای خۆیانیان بە ناوکۆمەڵدا بڵاوکردەوە ، بوونە ( هێڵێـکی‌لاری سەر بەوان لەناو حیزبێـکی سیاسی گەورەو فراواندا کە تێـکڕا کۆمەڵـگەو سەرومڕ هاونیشتمانیانە ٠٠!! ئیتر بێ‌دەنگ بون بە بەرەیەکی چەوت‌و نەگریس‌و نالەبار لە مێژووی نیشتمانیدا ! ئنجا هەروەکو پیسی‌وچەپەڵی یارمەتدەری میکروبن ( نەزانی‌و نەفامـی )و هەرچیەکـی لـەم دوانـەوە داکـەوێت‌و پەیدابێت‌و بوەشێتەوە ٠٠٠، بە کورتی کەم‌وکوڕی‌و ناتەواوی کۆمەڵـگە باروباوەڕی ئاشناوڕۆشناکانی ئەم گەلە کومپانیەیە بون ٠٠!

## ( ١٠ )

سەبارەت بەوەی کە مەڵبەندی ( هەقە )کان گەلێك لە دێهاتەکانیان نزیك وەیا لەناوچەی بیرە نەوتەکاندایە، بە تایبەتی بەشی سەروەو سەروی ڕۆژهەلاتیان سەرپەرشتکارانی ئەم « بیرانە »ش دوای هەوڵدانێکی زۆر نەیانتوانی پیرو شێخەکانیان بکڕن و بیان کەن بە کوتەکی دەستی خۆیان ..! لەهەر ڕوویەکەوە بوبێت بەڕاستی ئەمەیان مایەی شانازیە بۆیان .. ئیتر لەڕێرەوو ئەنجامی ئەم هەوڵو کۆششەیاندا ئەوسەر پەرستکارانە بۆیان دەرکەوتبو ، گەیشتبونە بڕواو قەناعەتێك Certainty مادام نەبون بە پیاوو نۆکەریان ، کەوابو بۆ بەرژەوەندیەکەیان وەزنگیان هەیە ..! ئیتر کەوتنە هاندانو تیژکردنی « ئەموئەو » لە ( هەقە )کان بەهەرناوێکەوە بێت بۆ کێش کردنیان بەلای ! (گەڕی بارەترێ)و شەڕی لابەلادا ..!! یان خەریك کردنیان بەم بەزمو ڕەزمەوەو لەبیر بردنەوەی مەسەلەکەیانو ناشیرینکردنیان لای خەلکی ..! خۆ ئەم سەرپەرستکارانی بیرەنەوتانە .. لەم ڕووەوە ئەوەندە کارامەو لێهاتون باوەڕ ناکەم بۆ بابەتەکەیان لەسەرناوو ناتۆرە ، وەیا پەلپ وبیانو پەکیان بکەوێت ..! گەرچی ڕووکارو دیکورو ! (عنوانی) هاندانو بەهانەکەش ژنوژن خوازوتەنگ چەلەمەی کۆمەلایەتیو وەیا جۆگەو ئاوو کێشەی

( تسویه )بێت ! ئەم کێشەیە کەلەبنەڕەتدا بۆ قوڵکردنــەوەی ناکۆکــی نێوان خەڵكو تێکدانو ، وێرانکاری لە کاردا بوە ••!

تەنها لەڕووی بەڵــگەو ڕوونکردنەوەوە دەیهێنینەوەو هیچیتــر ئەمەیان نیشانەیەکی زەقو ئاشکرایە بۆ ئەوکردوکۆشە ( الاجراءات )کە دژ بە ( هەقە )کان لە کاردا بوە • مامۆستا ( شاکر فتاح ) کـــەوا خــۆی ئەوسا ( قائمقام )و لێپرســراوی یەکەمــی ئاسایشــی بــوە لەقــەزای ( چەمچەماڵ )دا ، « لەکۆمەڵــە ڕۆژنامــەی ـ چەمچەمــاڵ »ە کــەیدا بڵاوی کردۆتەوە ، وەکــو ئــەو دەڵێت ( هەقــە )کان لــە ( ٣٥ ) دێی ناوچەکەیدا هەبوە دیارە مامۆستا ( شاکر فتاح )یشــی ســەبارەت بەجــێو شوێنی فەرمانڕەوا یەتیەکەی ، لەبارەی پەیوەندایەتی ناو خەڵــکەوە ، چ بەنیسبەت ئاژاوەوە بە هۆی لایەنگریو لاسەنگ کردنی میلیتەرازووی داوەریەوە ( العدالة ) ••چ لــە دامــەزراویو پتەوکــردنی ئاســایشــی بەرکەماڵیدا سەربارەت بەداوەری ، وپەیڕەوکردنی یەکسانیو بە یەکچاو سەیرکردنو پاراستنی بەرژەوەندی خەڵــکەوە ، بەبێ جیاوازی ، لەبــەر ئەم جێــگە تایبەتیو گرنگەی مامۆســتای نــاوبراو وتەکانــی لــەمووەوە بایەخێکی تایبەتی هەیە •

لە ژمارە (١) ڕۆژی ١٩٤٦/٧/١دا لەلاپەڕە ( ٩/٨ )دا لــەبارەی ( هەواڵــی چەمچەماڵ )ەوە لــە کۆمەڵــە ڕۆژنامەی ( چەمچەمــاڵ )دا بەناوونیشانی شەڕو ئاژاوە : [ لە ناوەندی دەستەی « شیخ عبداللــــەی گوپتەپە »و دەستەی « سەید احمدی خانەقا »دا لەســــەر ئــاوی دێی « عەسکەر » لەمانگی پێشودا شەڕە تفەنگێكو هەراو هوریایەك ڕوویدا یەکێك لە دەستەی ( شیخ عبدالله ) کوژرا بەڵام فەرمان ڕەوایی زوو فریا کەوت ، شەڕەکەی کوژاندەوە ، لەشکری ( حقەکانی شیخ عبداللــەی

گۆك تەپەی ) بلاوە پێ کرد ، پێنج کەس لە ( حقە )کانو هەر چوار کوڕەکانی شیخ عبداللەی خستە بەندیخانەوە ، پیاوێکی سید احمدی خانەقایشی گرت ( ئاوەکەی عەسکەر )یشی خستە بەردەست سید احمدی خانەقا کە بەفەرمانی پارێزگاری کرکوك درابوە دەستی ]تەواو .

لەمەدا بە کای کۆن بەبا کردن ــ سەرەڕای ئەوەی کەپێشینانمان پەسندیان نەکردوە ــ ناگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا چۆن گەلێك جار ، تانوپۆی پیلان بۆ ( هەقە )کان هونراوەتەوە ..!؟ چونکە لەتەپو تۆزی ئەو بەباکردنو شەنو کەوەدا ، ڕاستیو حەقیقەت نوقوم دەبێت ، جگە لەهەندی ئەنجامی نالەباری تریشی لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ..! هەروها ناکرێت ئۆباڵی کەمتەرخەمیو دریغ لەڕوونەدان وەیا ڕوودانی تاوانو کوشتن لەم کارەساتەدا کەخاوەن کۆمەڵەڕۆژنامەی چەمچەماڵ دەگێڕێتەوە بخەینە ئەستۆی کەس .. تەنانەت ئەستۆی لێپرسراوی یەکەمو پارێزەری ئاسایشی ئەوسای ناوچەی چەمچەماڵیش ..! چونکە ئەم تەنها واشەرێك وە یابورغیەك بوە لە دامو دەزگای مەکینەیەکی زلدا .. بەتایبەتی بۆ دوژمنایەتی کردنی ( بەرە )یەك کە دەمێك بو دروشمی ئافەرۆزکردنیان ڕاستەوخۆ ، لە کوێخاو گزیرەکانی ( بیرەنەوتەکانەوە ) ..! ( هەڵکرا بوناویان کەوتبوە ناو ناوانەدە ، وکەتبونە بەرچا و ودەموخوێنیان کرابوە کاسەوە ..! بەرامبەر بە ( بەرەیەك ) کە دوژمنایەتی کردنیانو کەوڵیان قیمەت دەکات ..! ئەمە سەرەڕای هەوڵو تەقەلای تریشو گەمارۆدانیانو سەغڵەت کردنیان ، لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئەوساو هەندێ دەستەوتاقمی سەربە ( میری )و سەربە ( بیری ! ) کە هەمیشە لەکاروگەڕدابون دژ بەوان .. هتد ، دیارە لە وەزعو بارو تێکەولێکەیەکی وادا ..!و لەبە جەرگترین هەڵویستدا ، هەڵوێستێك کە نەهێنی مەبەس ، وەیا مەبەسی نەهێنی ، لە وەزعو

باروتێـکەولێکەکەدا بێتە ناوئاخن‌و ئاشـکرا نـەبێت ، ئا لـەم جۆرە هەڵوێستانەدا ، تا ڕادەیەك مەردایەتی‌و ، ویژدان ، وئازایەتـی فـەردی ـ تاکە کەسێك ـ وون دەبێت چونکە : ( ڕەواو ماف‌و هەقێك ) پێشـێل دەکرێت ، بۆیە کەس پرکێشی ناکات ، پێ بنێت بـەو پشـکۆیەدا وەیـا بچێتە ژێر ئەو دارە شکستەوەو دان بەکردوکۆشەکەی خۆیدا بنێت‌و بـە ( دۆی خۆی بڵێت ترشە ․․ ) ! چونکە ئەو کەسـەش ، لـەئەنجامـی شاردنەوەی مەبەسی نەهێنـی بەنیسبەت خۆیـەوە ، دوو دڵـە لـە ڕەواو ناڕەوایی کردەوەکەی خۆی دڵنیا نی‌یە ․․ بۆیە پێ دزێی لێ دەکات تا بەشی ( ڕۆژێ لە ڕۆژان ) بهێڵێتەوە ، بۆیە لەباس‌کردن‌و ناوهێنانی سـڵ دەکاتەوە و قورقەپێ لێ دەکات ․․! خۆ ئەگەر وانەبێت زوو کەڵەشێری سەربارەدار خۆی بەکرپارو بەخەڵـکی دەناسێنێت ․․!

بۆ زێدە ڕوون کردنەوە ، تاکو حەقیقەت‌و ڕاستی لەم ( هەراوهوریا) یەدا دەرکەوێت ، کـە میلی تەرازووی داوەری ( العدالة )لەو ناکۆکیەدا بە لای چ‌لایەکیاندا لاسەنگ کراوە ! جگـە لەمەشـ ( سـلاو )ی بـۆ دراوەتەوە ․! بۆ ئەمە بەسە پوختەیەکی سەرژمێری ( Statiatics ) کارەساتەکەو ئەنجامەکەی پێشکەش ڕۆشنبیران دەکەین تا ئەوان لەسـەر پوختەی‌ئەنجامەکەی بڕیاری لایەنگرتن لەو کارەساتە دراماتیکیەدا بـدەن بە ڕۆشنبیرێتی خۆیان زاڵم‌و مەزڵوم ، لایەن‌وپشتگرتن لەو بێنـەو بەرەو گرت‌و بردەدا ساغ کەنەوەو بدۆزنەوە : ـ

أ ـ یەکێك لە دەستەی ( شیخ عبدالله کەلە ( هەقە )کانە کوژرا : ١

ب ـ پێنج کەس لە ( هەقە )کان گیران ٥

حـ ـ چوار کوری « شیخ عبدالله » خرانە بەندیخانەوە ٤

---

گیراووکوژراو = ١٠

لەم سەر ژمێرەیەوە ( دەکەس ) لە ( هەقە )کان دووچاری زیان بون ئەمە ئەگەر دەست دانەگرین ، کوشتن لەم کارەساتەدا هەر بە (زیان)! دابنێین و بەس •

بەڵام لایەنەکەی تری ناکۆکیەکە ، تەنها یەك کەسیان لێ گیرا •• خۆزگە ئەم ( قلە )ش نە دەگیرا ••! ئەمە وادەگەیەنێت کە ڕاژەی ( نیسبەتی )زیانی لاکەی تر لەچاو زیانی ( هەقە ) کاندا یەك بە دەیە ( ١ : ١٠ ) ، ئەنجامەکەش ئاشکراو ڕوونە : ( ئاوەکەی عەسکەر )یش بە بەراوەکانیەوە ، بە فەرمانی پارێزگای کرکوك درایەوە بە سید احمدی خانەقا ، وەکو لەکۆمەڵە ڕۆژنامەی ــ چەمچەماڵ‌دا نوسراوە • ئاو بێنەو دەست بشۆ •• ئیتر ئەم کوشتن و گرتنە لەپێناوی چیدا کە پێشتر لە لایەکی ترەوە بڕیاری ئەنجامەکی درایێت ••!؟

ئنجا نازانین ئەو هەراوهوریایەی کە لێپرسراوی یەکەمی ئاسایش زوو فریای کەوتوە مەبەس لەبەرپاکردنی ئاووتینوێتی بوە ، ئەو ئاوەی کە بناوانەکەی لە سەرەوە بەفەرمانی پارێزگاری کرکوك هەڵبەسترابو ، زووتریش بڕیاری لەسەر درابو ••! یان تەنها تینوێتی بوە بۆ کوشتن و گرتن و شەڕ فرۆشتن بە ( هەقە )کان ••؟! دیسانەوە گرتنی چوارکوڕی « شێخ عبدالله »و پێنج کەس لە ( هەقە )کان ئەم دوو ژمارەیە کە لە یەکتریەوە زۆر نزیکن و ئەوەندەیان بەین نی یە ، لە ڕووی کۆمەڵایەتی • وڕێڕەوی چون یەکی ئەوسای ناوخەڵکیدا ، مانایەکی تایبەتی هەیەو گەلێك شت دەبەخشێت •! ئەم دووژمارەیە وا دەگەیەنێت کەلە بەلاو مەینەتیدا ، لەناو سرەوڕیزی( هەقە )کاندا یەکسانی و تەبایی و جۆرە دیموکراتیەتێك لەناویاندا هەیە ••! ئەگینە لەکارەساتێکی وەهادا بە دەگمەن ( کوڕەشێخ ، کوڕەئاغاو بەگزادە ••! ) بە ژماردە ، ئەوەندەی

دەست پێوەندەکانیان‌و بەقـــەدەر ئەمان پێـوە دەبـن ! بەڵـکو لــەم جۆرەکاروبارانەدا ، لە زەبرو زەنگ‌دا ، لەگرتن‌و بردن‌و سەغڵەتیدا زیاتر بە شی ( مسکێن‌و ڕەعیەت‌و مریدو مەنسوب‌و مەحسـوبی ) پێوەیـە ، وە زۆرتر خەڵـکی‌ترو جەماوەرەکە دەگرێتـە وە وتووشـ دەبـن نــەك ئەوان ••!

هەرچۆنێك بێت ئەنجامی دەست‌کەوت‌و زیانی بە هەردوولایەنـــی ناکۆکیەکە ، لەو هەراوبەزم‌و ڕەزمەدا ، تەواو دیارەو هیچ پێویستی بـە ئەنگوست نی‌یە •• لە ڕاستیدا ئەمە گەڕو گێچەڵ کردن بە ( هەقە )کــان دەرخات لە هەراو هوریایەکدا کە لێ‌پرســراوی یەکەمـی ئاسایشـــی چەمچەماڵ بە قســـەی خـــۆی زوو فریـای کەوتــوە ••! لە زوو فریاکەوتنەکەشی ، زووتر ڕای خۆیی بەجۆرێـکی گشتی ، بەرامبەریان دەربڕبوە و کردونی بە بەرەیەك لە ( اســماعیلیە )کان کــە بــە زەبــری ( بێهۆش‌داڕو ) گێژو ، وێژ کــراون ، لاپــەرە ( ١٠١/١٠٢ )کۆمەڵـــە ڕۆژنامەی چەمچەمــاڵ •• خــۆ ئەگــەر پەیدابوونـی وەزع‌و بارێـکی کۆمەڵایەتی ، بە داوودەرمان ئامــادەبکرێت ، ئەوسـا کــۆڕو کۆمەڵانـی ئیستیعمارگەران ، بەئاسانی دەتوانن بەسەر ڕێڕەو چارەنوسی کۆمەڵایەتی میللەتاندا زاڵ‌بن ••! دەتوانن ڕەچەتەی ( ڤالیوم )ێك سازکەن‌و مێشکیان بشۆن‌و بیان هێننە ژێربار ••! ئیتر پێویست بەچەکی ( بیرولەش )! ناکات بۆ بەکارهێنان لە زۆرانبازی‌و تێـکۆشاندا ••! خـــۆ ئەگــەر کــردەوەو ڕەوشتی ( هەقە )کان بە بێهۆش داڕوو بوبێت ، وەکو ئەو دەڵێت •• ئەوسا بۆسۆیەك وەیا هەر بۆنێـکی‌تری کەسکون بدرایە بەلوتیاندا ، لەوانەبـو بهاتنایەوە هۆش خۆیان •! ئیتر هیــچ پێویست بە ئەرکــی پێشـنبازی دوورخستنەوەی پیرو شێخەکان‌و میری لێ هاندانیان ناکــات وەکــو لــێ پرسراوی یەکەم لەئاسایشی ئەوســای ناوچــەی چەمچەمــاڵ لەکۆمەڵــە

ڕۆژنامەی چەمچەماڵە کەیدا دەری بڕیوە ..! وا دیارە بەرنامەکەی مستر ( سی . جی . ئەدموندز )ی زۆر بە دڵداچوە ، بۆیە هەستو هەڵوێستی بەرامبەر بە ( هەقە )کان لەداخو زوخاو پێ ڕشتن دەچێت ..

بە شێوەیەکی گشتی لاسایی کردنەوە : گیانی لێوردبونەوەو لێکوڵینەوەو بیر کردنەوەو ( عقل )و ژیری پەك دەخات ، مرۆڤ دەداتە دەست ئاهی نەگرفتە ! و بەرەو ڕووی گریمانێکی ( Assumption ) بێ جێی دەکاتەوە ..! دەدەی کاتە کینەیەکی قورمیشکراوی بێ هەستو گیان ، ڕەوشتو کردەوەی شێوەیەکی دینامیکی ( Dynamic ) ڕووتی دەگرێت ، چونکە لەقەبارەی ڕاستەقینە زیاتر دەخاتە سەر ( کابرای لاسایی کەر ) لەبارەی توانای خودی خۆیەوە ( Ego ) چونکە لە بەشی یەکێکی تر ـ واتە ( لاسایی کراوەکە ) دەخاتە سەرخۆیو ناشی یانەش بەکاری دێنێت ! وەکو یەکێك : حەز لەدەستێك جل بکات لەبەری کات بەڵام خۆی ئەو جلوبەرگەی نەبێت ، ئنجا بێت ، لە یەکێکی تری بخوازێتو بەقەدەر خۆی نەبێت ..! ئەمە لەبارەی خۆیەوە ، کە خۆیی پێوە سەغڵەتو گرانبارو ناشیرین دەکات ..، ج لەبارەی ڕادەی تێگەیشتنو ڕۆشنبیریتی کۆمەڵگەکەیەوە بێت بەرامبەر بەهەڵسو کەوتو کردەوەکانی یەوە لە ناویاندا ..! بەپێی پێوەرو گێجی ( المقاییس ) وەختو زەمانو ئەندازەی پێشکەوتنی کۆمەڵگەکەی ... هتد ، ئەوساڵەو بارو دۆخەی کە هەیە ( واقیع Reality ) لا دەدات ، دەبێت بەگژ واقیعەکەدا بچێت ، بە پێی بیرو باوەری خۆی بی گۆڕێت .. هتد بەڵام ئایا مەکینەیەکی قورمیشکراو توانای بیر کردنەوەی هەیە ، تا باوەڕو بڕوایەکی هەبێت ..! ئەگینە لەم حاڵەتەدا واقیعەکە ، وەکو کردارێکی بەرپەچدانەوە ( Reaction )

به گژیدا دەچێتەوەو یەخەی دەگرێت ••، بۆیە لاسایی کردنـەوە لـە ڕەوشتی کۆمەڵایەتیدا کارێـکی نەنـگ‌و ناشیرینـە ••! لـەم ڕووەوە پێشینانمان دەربارەی گرانبـاری لاسـاییی‌و ئەنجامەکەی بە نیسبەت گیانلەبەرو ، تەنانەت باڵندەی وەکو ( قازومریشـکی )ەوە بڕیارێـکی بەجێیان لەسەر داوە ••!

## ( ١١ )

بێ گومان ئەگەر بێ « بڕیارێـکی پێشین »و بەچاوێـکی ڕەخنەگری ! پێشەنگ‌و بنچینــەی ، هەڵسەنگانــدن‌و بــەراوردو ( شــی‌ی ) کردنــەوەو پشکنین‌بن ئەم چەشنەهەوڵ تەقەلایە دەبێتە شێوازێـکی زانیارانە (علمی) ، جێ‌ی متمانــەو باوەڕ لــە ڕوون کردنــەوەو گەیشــتن بە ( حەقیقــەت )و ڕاستی‌دا ••! لەم کەلێنەوە بابگەڕێینەوە بۆ نوسینەکەی مامۆستا ( جمال بابان ) کە لە ڕۆژنامەی (العراق)ی ژمارە (٢٣٣٤) ڕۆژی ١٩٨٣/١٠/٥دا بڵاو کراوەتەوە •• لەسەرەتاوە باسی بابەتێکیمان کرد ، ئێستاش بــۆ دەرخستنی لایەنێـکی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتی ( هەقەکان ) ••• لایەنی هێمنی‌و ئاسایشــی پەروەریەکەیــان ، کە لە واقیعدا ئاوێنەیەکــە ، کــەوا ڕەوشت‌و کردەوەیان خۆیی تێدا دەنوێنێت ••! ناڵێم سەرومڕ ئاسایش وەیا « پەتی » وەیا هەر چۆنێك بێت چــونکە دەگــونجێت بــە زۆرەملــی ( Coercion ) بە جۆرێـکی ناقۆلا ( سلبی ) تا ماوەیەك ئاسایشــی بەرکەماڵ بێت‌و کەس لەکەس نەکەوێت ••، بەڵام ئەمە چ ئاسایشێـکە کە بە زەبری داپڵوسین‌و تێ‌کوتەوتێ‌بڕە ••!! دامەزراوێت • ئەمەیان خۆی لەخۆیدا ئاسایشە دەڵێم کە لە هۆش‌و هەستەوە هاتبێت •• وەبە جۆرێـکی

باش ( ایجابی ) بارودۆخی چۆنێتی دەروون ( سایکۆلۆجی )و لایەنەساغو سەلیمەکەی ...، نــەك لاینــــە نەخۆشەکەی کــە یرتیە لەشپرزەیی ( القلـــق Anxiety ) ، ئەو شپرزەییە کە پۆپــەی پەشۆکانــەو ڕاستەوخۆ کار لەباری ئاسایش و هێمنی دەکات و دەی شلەقێنێ و دەی کاتە ئاشوب و ئاژاوە ..! بۆیە نوسینەکەی هەر وەکو ( افــادە )ی شــایەتێك ، کوتومت دەنوسمەوە ، تۆزێك گفت و گۆی لەســەر دەکەین تا کفت و گۆی دڵی بە پەرۆشان و وێڵ بوان بەدوای ( حەقیقەت و واقیع دا ) بنیشێتەوە ..! مامۆستا ( جمال بابان ) دەڵێت :

[ یەکەم : ئاسایش : ئەو ماوەیەکە لەوناوچــەیەدا بــوم ، جــارێك نەمبیست شەڕ یا هەرایەك لەناو ( هەقە )کاندا ڕوبدات ، یاخەرمانێك ، یاخانوویەك بسوێنێ یادزی ماڵ و ئاژەڵ بکرێت ، یاخود ژن هەڵبگرێت کــە ئەمــانە لەدێهاتەکانی تردا ئــەو ڕۆژە ڕەمەکی بــون .. زووزوو دووپــات ئەبونەوە .. تاکو ڕۆژێك نەمدی یەکێك لە دانیشتوانی دیهاتی « هەقە »کان بێن لەپۆلیسخانە ، لای مدیری ناحیە شکات لەیەکتر بکەن ، یاخود یەکێك شکاتیان لێ بکات ، هەر بەقەستی چاوەڕوانی شتێــکی وام ئەکرد ئێستاش نەمدی .. ] ــ تەواو ــ

نامەوێ لەنوکەوە دەست پێ بکەمەوە ، بەڵام هەر بۆیاداوەری دووپاتی دەکەمەوەو دەڵێــم : « ئەوژیانــە کۆمەڵایەتیەیــان کەلەســەر شــیرازەی یەکسانی و تەبایی لە دابەش کردنی خێروبێرو بەرهەم پێك هاتبو .. »وە جۆرە هاوبەشێتیەکی ( الاشتراکیە ) ساکاری تێدا بەدی دەکراو دەهاتەدی ــ ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ( مصطفــی عســکری ) ــ لەئیشــ و فرمانیشدا ، یارمەتی و هەرەوەزکاری دەوری تێدا دەبینی ــ ( بەندی دووەمی نوسینەکەی مامۆستا جمــال بابان لەڕۆژنامــەی ــ العــراق ــ ڕۆژی

٥/١٠/١٩٨٣دا بلاو کراوەتەوە ••! ) ، ئنجا سەبارەت بەم یەکسانیەو سودمەندبونیان « چونیەك » لەبەری ڕەنجی خۆیان ، لەبەر ئەم یەکسانیءو تەباییە ، هەمویان بە یەکچاو سەیری کەلەوپەلو تفاقو ماڵو ئاژەڵی یەکتریان کردوە ، هەریەکەیان ئەو شتومەکانەی کە هەیانبوەو بۆ سودی گشتی بەکاریان هێناوە ، بە هینی خۆیی زانیوە •• ئیتر چۆن دزی لە خۆی دەکات ••!؟ هەر بەهۆی ئەم یارمەتیءو یەکسانیەوە بو ، لەکاتێکدا کە دێهاتەکانیان بون بەژێر ئاوی ئەستێلکی ( دوکان )ەوەو ماڵیان لێ تێك چوو ، بەم لاولادا گوێزرانەوە ، لە تەنگانەو لێقەوماندا خۆڕاگربونو باکیان نەبو ئەنجامەکەشی پێیانەوە دیار نەبوو ••!

هەمیسان لەڕووی ژن هەڵگرتنیشەوە ، وەکو لەپێشەوە وتمان : لەبەر ئەوەی کە ئاسۆی تێڕوانین یان بەرامبەر بەئافرەت فراوانتر بوو ، لەچاو ئاسۆی کۆمەڵگە گەورەکەی کە تیایدا دەژیانو لەڕوانگەیەکی تاریكو لێڵەوە سەیری ئافرەتیان نەدەکرد ، چونکە بە ئادەمیزادێکی ئیشکەریان دەزانیءو دادەنا ، لەبەر ئەمە جێگەیەکی تایبەکاری هەیە لەناویاندا •• ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە ، لەبەر نەبونی جیاوازیەکی ئەوتۆ لەناویاندا لەژیانو گوزەرانی ڕۆژانەیاندا ، جیاوازیەك کە ئەندامانی کۆمەڵگەکەیان لەیەکتری هەڵبوێرێتو جیاکاتەوەو بیانکان بە چەند دەستەو تاقمێکی ( خواروژوور )! وەیا بە بەرەی ( خانەدان )و ( بۆرەپیاو ) ، کە ئەم جیاوازیە هەستی مرۆڤایەتی ، سەر کوتو سەر کوێر دەکات ••! لەبەر نەبونی ئەم جیاوازیە : ژن هێنانو شوو کردنیان ئازادیەکی تێدایەو هەر لەبەر ئەمە پێویستیان بە لادان ! و سەرپێچی ، وەیا هەڵگرتنی ئافرەت (Woman - Abduct) نیيە ••! خۆنەریتی ژن هەڵگرتن لە وڵاتی ئێمەدا شتێکی ئاشکرایەکەوا ڕژێمی دەرەبەگایەتی یەکەمین هاندەرو پشتیوانو پەنا ، تەنانەت « داڵدەی » هەڵگرو

هەڵگیراوبوە •• هتد ، وە لەهەمان کاتیشـدا نـاو بژی کـەرو بـرای مەسلەحەتیش بوە •• چونکە : أ ـ ئەم ڕەدوو کەوتن و ژن هەڵـگرتنە مایەی ئاشوب و ئاژاوەو ڕق و کینەو شلۆق کردنـی پەیوەندایەتـی ناوخەڵـکی بوە •• هتد ب ـ لەناوبژی کردن و مەسلەحەتیشدا سودی گیرفانی کاکـی دەرەبەگی تێدابوە ••! بەکورتی داهات و دەستکەونی مادی و مەعنەوی لە ژن هەڵـگرتندا ، دەڕژایە گەنجینەی پرستەمی ڕژیمی دەرەبەگایەتیەوە ••

ئنجا بەم بۆنەیەوە دەڵێم ئەگـەر یەکێـك بی وێرایـە ، دەسـتی بـۆ ئافرەتێـکی دەرەبەگەکان بهێنایەو هەڵی گرتایە ، وەیا ئافرەتەکەیان پێی لەجەرگی خۆی بنایەو ڕەدووی کوڕە لاوێـك بکەوتایـە ، بەمـەرجێك لەبەرەی کۆمەڵایەتی خۆی نەبوایە ، ئەگەر شانس و ڕێـکەوت یارمەتی بدانایە سرگوم و سەرنگون نەکرانایە •• بێ گومان هـەردووکیان نامۆو سەرگەردان دەبون و مەرگی خۆیان بە ئاوات دەخواست •• ئیتر ئەنجام و چارەنوسی ئەم ڕەوشتی هەڵـگرتنە هەرچۆنێك بوبێت ! بەڵام کردەوەکە : هاوارە ، سەرپێچی یە ، یاخی بونە لەداب و دەستوری کۆمەڵـگەیەك ، کـە ڕێـگە لە خاوێن ترین پەیوەندایەتی دوو ئادەمیزاد دەگرێت ، لەڕێڕەوی ژن هێنان و شـووکردن و ڕێبازی هاوسـەررێتیانـدا ( الزواج ) کە بەبـێ ئەم هاوسەرێتیە کۆمەڵـگەی ئادەمیزاد دەپوکێتەوەو گەشە ناکات ••! بەم بۆنەیەوە ئەوی دەبێت بوترێت کە لەواقیعیشدا بەڵـگەیەکی زەق و ئاشکرایە بۆ یەکسانی و تەبایەکەی ناو ڕیزی ( هەقە )کان ، گەرچی لـەم ڕووەوە پێویست بەناوهێنان ناکات •• لەژن و ژن خوازدا ، شێخانی سەربە ( هەقە ) بێ پەروا کچی خۆیانیان داوە بەمریدەکانیشیان با مریدەکەش لەڕیزوسرەی شێخەکانیان نەبوبن ••، چ لـەڕووی بنەچەشێخێتیـەوە وەیا لـە ڕووی بون و نەبونەوە ••! کەچی چینە جیاوازەکانی تر کەلەبارەی کۆمەڵایەتیەوە لەسرەی پێشوەی کۆمەڵـگەدان مریدو بۆرەپیاو ( العـوام ) بەشایستـەو

لایەقی ئافرەتانی خۆیان نازانن ..و هەرچونێك بێت پڕ گێشی ناکەن کە ژنیان بدەنێ ، دیارە ئەوی باسم کرد نیشانەیەکە لەنیشانەکانی یەکسانیو جۆرە دیموکراتیەتێك لەناو ( هەقە ) کاندا .. بەڵام نێرینەکانی چینە جیاوازەکان ، بەئاسانی توانیویانە کە ئافرەت لەچینەکانی‌تری خوار خۆیانەوە بخوازنو بهێنن ..!

ئیتر کۆمەڵگەیەك کە یەکسانیو تەبایی لەهەمو سەرێکەوە باڵی بەسەردا کێشابێت دیارە ئەندامەکانی لەهەمو ڕوویەکەوە جیاوازن لەئەندامانی کۆمەڵکەیەکی‌تر کەیە چاوی خۆیان دەبینن ، ڕۆژی صەدجار هەمو بایەخێکی مرۆڤایەتیو ڕەوشتو خوو ( الاخلاق ) پێشێل دەکرێت، تەنانەت ئەم باڵ‌بەسەرداکێشانە کار لەچۆنێتی بیرکردنەوەی ئەندامانی کۆمەڵگەکە دەکەن ، یەعنی ئەوی‌لای خەلکی‌تر واقیعو حاڵە .. لای ئەمان تێی ناگەن بەتاڵە ..! بۆنمونە : ـ

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی ( شیرووداید‌ی )ناو کە پەیامنێری (المراسل ) ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکایی بو ، بەسەردانێك دەچێتە وڵاتی سۆڤیێتو ( مۆسکۆ ) ، لەوێ دەچێتە باغچەیەکی منداڵانەوە ، دوای خۆ پێناسین یەکێك لەمنداڵەکان پرسیاری لێ‌دەکاتو دەڵێت : ـ ڕاستە لە وڵاتی ئێوەدا ( ئەمەریکا ) تاکە زەلامێك بۆی هەیە کارگەیەکی هەبێتو بەچەند کەسێکەوە ئیش بۆ ئەو کابرایە بکەن ..!؟ ( شیرووداید‌ی) لە وەڵامدا بە فێزێکەوە ، کە گوایا وڵاتەکەی ئازادی کەسێکی ( الحریة الفردیة ) تێدا مسۆگەرە دەڵێت :ـ بەڵێ ئەمە ڕاستە تاکە زەلامێك ، وەیا کابرایەك بۆی هەیە کە چەندەها کارگەی هەبێتو بە هەزاران کرێکاری تێدا بێت ..! منداڵەکان واقیان وردەمێنێو سەرسام دەبن : هەمو بە یەك دەنگ هاواردەکەنو دەڵێن: ( ئای ، ئەی بۆچی میریتان ئەو تاکە زەلام ،

ئەو کابرایە ناگرێت‌و لە بەندیخانەی توندکات ••!

ئیتر ( هەقە )کان بەم یەکسانی‌و تەبایی‌و هاوبەشێتی‌یەیان لە ژیان‌و گوزەرانی ڕۆژانەیاندا ، لەگەڵ بوونی ئەم یەکسانی‌و تەبایی‌و هاوبەشێتیە ، بە پەرگەماو شیرازەی کۆمەڵگەکەیان تا ڕادەیەکی زۆر ، پەرزەی دەغەڵی‌و ڕق‌وکینەیان بڕیبو ••، لە ڕاستیدا شەیتانیان کەڵەمەو ( شەیتان‌لغاو )کردبو ••! ئەو ڕەق‌و کینەیەی کە ئەنجامەکەیان هەر ئادەمیزاد کۆڵەوار ناکات‌و خەرمان‌و خانو گڕ تێبەر نادات •• هەتد بەڵکو ( کلك‌وگوێ )ی گوێ درێژو بێ‌زمانیش لەئەنجامی ساماکیان ڕزگاریان نەبوە !! بۆیە لەم ڕووەوە وتەکانی مامۆستا ( جمال بابان ) کەلەسەربنچینەی ( ظاهر ) بینی‌بوە ، شایانی باوەڕو جێی متمانەیە ••!

مامۆستا ( جمال بابان ) لەهەمان وتاری بلاوکراوەیدا لە ڕۆژنامەی ( العراق )ی ڕۆژی ٥/١٠/١٩٨٣دا لەبابەت ( شطحات )و قسە بزرکاندنەوەوە کەوا لەگەڵ ڕێبازی ( تەسەوفدا ) ناگونجێت‌و دەبێتە لەکەیەك‌و هۆی تەکینەوەی خەڵك لە خاوەنەکەی‌و سڵەمینەوە لە ( هەقە )کان دەڵێت : ( شێخ عبدالکریم لە سۆفیەکانی ئەداو بەتوندی لەگەڵیانا ئەجولایەوە کە ئەو ڕێگایە نەگرن بەجۆرێك داوای مەخفەرێکی پۆلیسی کردبو لەوێ •• بەلام شەپۆلەکە هێند بەهێزبو شێخ عبدالکریمیشی‌ڕادا •• ) ـ تەواو ـ لەمەدا ئەوەندەی من بزانم لەبابەت کردنەوەی مەخفەری پۆلیس لەسەرگەڵودا ، وەکو لەدەمی دوو ئامیر مەخفەریانم دەبیست کە بەرودوابون بە ئامیر مەخفەری ئەوێ ، ئەم دوانەش خوالێ‌خۆشبوان ( حامد اسعد )و ( سید رشیدی جەباری )بون•• تەنانەت خوالی‌خۆشبو ( حامد اسعد ) ژنی دووەمی سەرگەڵوییە ، وەخۆیشی خاڵی هۆنەری نەمر ( گۆران )ە کە بۆ دیدەنی جاروبار دەهاتنە

لای باوکم‌و دەیان‌وت : مەخفەر لەسەرگەڵودا لەسەر داخوازی‌و داواکردنی خواڵی‌خۆشبو ( شیخ حمەصدیقی کوڕی شیخ عثمان )و پێشنیاری مستر ( شپرد ) کە ئەوسا پشکنیاری گشتی ( مفتش عام ) پۆلیس بو کراوەتەوە ، سکالایان دەکردو دەیان‌وت : ئیتر ـ سەرگەڵو ـ ئەوەندە هێمن‌و بێ‌دەنگە هیچی تێدا ڕوو نادات •••، کەچی هەمو سەری مانگێکیش ڕاپۆرت‌و لیستەی سەرپێچی‌و تاوانیان لێمان‌و دەوێت ، نازانین چی بکەین ••!؟ باوکیشم بەلاقرتیەکەوە پێ دەوتن ، کەوابو خۆتان شتێك دروست‌کەن ••!

لەو باوەڕەدام لەبارەی مەخفەری پۆلیسەوە ئەم ڕایە ڕاستە ، چونکە ئەگەر خواڵێ خۆشبو ( شیخ عبدالکریم ) پۆلیسی بویستایە ، دەبو بۆ « شەدەڵە » بۆ لای خۆیی داوا بکردایە •• خۆ ئەگەر لەسەر داواکردنی فەرمانبەرانی ئەوسای گوایا میری نیشتمانی بوایە ، دەبو مەخفەرەکە لە ( شەدەڵە ) بێت چونکە ئێرە مەرکەزبو نەك سەرگەڵو ••! لەلایەکی تریشەوە ( بەرەی خواڵێ خۆشبو شیخ عثمان ) لەسەر گەڵودا لەگەڵ (هەقە)و (هەقە)یەتیدا نەبون ، سەبارەت بە خاوەندایەتی ( کێڵگەو ڕەزو باغ‌و ئاشەکانی بەردێ) بەرژەوەندیەکی تایبەتیان هەبو ، بۆیە لە ورووژانی خەڵکی‌و جم‌وجوڵی جەماوەر ـ هەرچۆنێك بوایە ـ سڵیان دەکردەوە ، بەنوشوستیان دەزانی بۆ دەسەڵاتیسان لە سەرگەڵودا ! دیسانەوە داوا کردنەکەشیان ، خۆی لەخۆیدا جۆرێك بوە لە ( پاکانە ) بۆ خۆیان ! و( ئاگرەسورێ •• لەخۆم دورێ ) ! تا لەدەمەوە نەدرێن‌و لای میری ناشیرین نەبن‌و تاوانبار نەکرێن کەگوایە : ڕەنگە ئەمانیش لە ( هەقە )کان بن ••• چونکە لە سەرگەڵودان ، وبەخزمایەتیش لە شێخانی سەربە (هەقە)وە نزیکن •• بەتایبەتی ئەمە لەکاتێکدا کەوا میری لە (هەقە)کان‌وە خۆ کەوتبو لەسەر چز بو لێیان ••!

نابێت لەبیرمان بچێت یەکەم کەسێك ، کە سنگەکەی لەقانـــدو سەردەقی پڕۆپاغەندەی شکاند دژبە (هەقە)کان •• وە (فەتوا)ی لـەئاین لادانی ئەمانی ئاراوە مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) بو وەکو پێشمـــتر باسکرا ( لاپەرە ۱۸۷ کتێبی ـ کرد ، ترك‌و عـرب ـ دانـەری مسـتر ( سیسل•جون•ئەدموندز) وەرگێرانی مامۆستا جرجیس فتح‌الله•هتـد ) لەلایەن ئەو داموو دەزگایەوە گەمارۆ دران کە مستر ( شپرد ) یشمـــــیان پشکنیاری گشتی ( مفتش عام ) پۆلیسیان بو ••! لەلایەن ئەو دەستەو دایەرەیەوە پەلامار دران‌و هێرش برایـە سەریـان ، کە ئـەو جوتـەو گەلێکی‌تری وەکو ئەمان کە سەرۆکی ڕەسمی ، وپێشەوای ڕاوتەگبیر ، وئەندازیاری دەروون‌و مامۆستای هەست‌و هەڵوێستیان بون ••!! ئاشکرایە ئەوی ئەوسا ئەمانە نەیان کوشتنایە کوردواتەنی نەدەمردن ••! دیـــارە بەدگۆیی‌و زەم‌کردن لەلایەن دوژمنی دەغەڵ‌و ناپاکەوە بەرامبەر بەهـەر لایەك بڵێت نیشانەی پاکی ئەو لایەیە •••، خۆ گەو ناپاکانیش ستایشی، ( مدح ) هـەر لایەك بـکەن بێ مەلامەت نی‌یە ••! بەم مانایە هۆنەری عەرەب ( احمد ابو طیب المتنبي ) وتویەتی :

اذا اتتك مذمتي من ناقص        فهي الشهادة لي بأني كامل

ئیتر ئەوی لە وتارەکەی مامۆستا ( جمال بابان )دا بایەخێکی تایبەکاری هەیەو پێویستی بە ڕوون کردنەوەیەکی هێنانەو لەسەر خۆ هەیە ، چونکە مەسەلەیەکی ناسکە •• سەبارەت بەوەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەکارو بارێکەوە هەیە کە زۆر لەمێژە میللەتەکەمان لەگەڵیدایەولەڕووی کۆمەلایەتیەوە ئالودەی بوەو دەقی پێوە گرتوە ، بەوپەڕی لەخۆ بوردوبی‌و ئازاییەوە بەگەلێك شێواز بەرگری لێ کردوە ، تەنانەت خۆیی ناوەتـــە پێناوی‌یەوە ، بوە بە بەشێك لەمێژوومان بۆیە لێ‌دوان لەمەسـەلەیەکی

وەها وریایەکی دەوێت ••! دەم تێوەدانو دەستداگرتن لێی خزمەت ناکاتو ئەنجامێکی پێچەوانەی دەبێت ، ئەو بەشە بایەخدارەش لە وتارەکەی مامۆستا (جمال)دا ، یەکەمیان خوا لێخۆشبو (شێخ عبدالکریم)ی شەدەڵە ، هەرگیز حەزی بە (شطحات)و قسە بزرکاندن نەکردوە لەبارەی ئاینەوە •• ئەمە شتێکی ڕاستە : چونکە بزوتنەوەیەك کە بنچینەکەی لە سەر ئاینو ، بەپەیرەوی ئاین پاراو کرابێت ، قسە بزرکاندن (شطحات) لەبارەیەوە لادانە لەفەلسەفەکەیو پەیرەو بیرو باوەڕەکانی ، سەرەڕای ئەمە ، بزوتنەوەکەش بێ فیکرەیەکی (ئایدیۆلۆجیا) ئاشکراو ڕوون دەهێڵێتەوە ••! ئینجا لەم حاڵەدا بەڵگە نەویستە (بدیهی) پیاوێك سەرکردەی ڕێبازێکی سەر بەئاین بێت ، چۆن بە بزرکاندن (شطحات) قایلە کە وارەنجی لەپەرستندا (Adoration) بەفیرو دەدات ، بۆ باوەڕە کەی زیانی هەیە ••!؟ هەمیسان بزوتنەوەیەك ئەگەر فیکرەیەکی ئاشکراو دیاردی نەبێت ، بێگومان ئەو بزوتنەوەیە توشی گەلێك تەنگو چەڵمە دێت ، ئەنجامەکەشی چەواشەو سەرلێشێوانە ••! تەنانەت کەسانی سەربەبزوتنەوەکە دەکەونە گێژاوێکەوە هەرچی ڕیشی سور بو لای ئەوان هەمزاغایە ••! بەکورتی بزوتنەوەکە بەلاشو خۆڕاییو کەساسو پاشەڕۆژێکی کولۆڵو تاریکی دەبێت ••! دوەمیان :ـ دوویاتی دەکەمەوە خوالێ خۆشبو ( شیخ عبدالکریم)ی شەدەڵە تا دوا هەناسەی ژیانی لەگەڵ (شطحات)و بزرکاندا نەبوە ، وەهەرگیز بزرکاندن لەبابەت ئاینەوە ( شێخ)یشی ڕانەماڵیوە ، بەڵکو وەکو پیاوێکی ئاینی ئاغو ڕێزی خۆیی پاراستوە ، چونکە چارە نوسەکەی چاکترین شایەتێنی ، کەوا هەژاریو بەپلارێکی نەهێنیەوە (الاغتیال) سەری ناوەتەوە ، وهیچی وەهای بەجێ نەهێشتوە بۆ وەچەکانی ـ چ لەشارو چ لەلادێ کەوا ئەمرۆ خۆیانی

پێوە (با) بدەن ..!

خۆ ئەگەر (شطحات)و بیدعـەت گۆییەك ڕووی دابێت ، سـەبارەت بە فراوانبونی بزوتنەوەکەو لەئەنجامی پێشوازی کردنیەوە بوە بە گەرمی لەلایەن جەماوەرانی هەژارو نەدارای لادێـکانەوە ، چونـکە یەکسانی هاوبەشێتیەکەی لەمەڕ ڕێبازی (هەقە)کان ، ژیانو گوزەرانێکی مسۆگەری بۆ سـاز کردبون .. هتد . ئەویەکسانیو تەباییەی کـە بەگوێ دەیان بیست ، وبەچـاو نەیان دەبینی،و هەستیان بەبونی نەدەکرد ..! بەڵام لای (هەقە)کان ئەمـە هەبێت کوردواتەنی ئاسمان ئەستونی دەوێت ..! بۆیە قەڵەباڵغیەکی بێشوماریان تێوروکابو ، بەجۆرێك کەڕێکخستنی لە وزەی خوالێخۆشبو (شیخ‌عبدالکریم)ی شەدەڵەدا نـەبو ، یـەعنی لـەڕکێفی سەرکردایە تیەکەیاندا نەبو ،کـە بتوانێت ، ئەو قەڵەباڵغیە ئامۆژگاریو تەمێ ، وتەسکینو دابین بـکات وەیا دەسەڵاتی بەسـەریدا بشکێت دەرەقەتی بێت ... ، ئەمـە لەلایەك لەلایەکی‌تریشەوە ئەم پێشوازیو بەپیرەوەچونی جەماوەرو قەڵەباڵغیە ، دەرگـای خستە سەرگازی پشت بۆ هاتنـە ژورەوەی کەسانی (ڕاسپێرراو)و (نێرراو) !!و تێکەڵاو بونیان بەبزوتنەوەی (هەقە) بۆ تێکدانی ڕیزیانو ناشیرین‌کردنیان ...!! مـادام ناحـەزو دوژمنی یەکسانیو هـاوبەشێتی ، وتەبایی لەناو کۆمەڵـگە فراوانەکـەی کە (هەقە)کانی‌تیـایدا دەژین بەسـەر زیندونو جێی دەستو دەمیان هەیە ..!!

## ( ١٢ )

ئیتر دوای ئەوەی کەهـــەوڵو تەقـــەلای لەخشتە بـردنی (شێخ‌عبدالکریم)ی شـەدەڵە وشێخانی سەربە(هـەقە)و ڕاکێشانیـان بۆ ڕیزی ڕەسمی سـەری نەگرت ئنجا کنەکردن لەژێرەوە (القاعدة) لەناو (هەقە)کاندا دەستی پێ‌کرد بۆ هەڵخلیسکاندنیانو سەرکـــەوتنی ئـەو پیلانەی کـەلە ئارادابو بۆیان •• دورنی‌یە لەڕێبازی ئەم کردوکۆشەدا، دامو دەزگاکەی مستر (سی•جی•ئەدموندز) باربوی نەکردبن ! پیـاوانی سەر«بەم» نەچوبنە ناویانەوە ، ڕێبـازی بزڕکاندنو (شطحات) بۆ خۆش نەکردنو پیشان نەدابن •• تابزڕکاندن پیشان نەدابن • • تابزڕکـاندن بەئاینـەوە بـکات بـــە دروشمو سفەتی سەرەکیـان ، تابسرەوێنێتە سەرکردایەتیەکەیان ، مادام ئەم سەرکردایەتیەی بۆ لاس نەدراوە •• ! کەوابو با لەئەندامو کەسانی لاسـار ، ولاجڵەوەو هەڵمەتە کاسەکانیانەوە دەست‌پێ بـکات ••! دەگونجێت ئەوانەی کـە بەئاینەوە دەیان‌بزڕکاند ، وەیا ئەو ڕێبازەیان گرتبو (ئەدموندز) ناس‌نەبوبن •• چونکە (شطحاتو بزڕکاندن) شتێکی فیکریە ، لەهەموو بزوتنەوەیەکدا ــ هەر بزوتنەوەیەك بێت ــ ئەمـە نەخۆشیەکی فیـکری بزوتنەوەکەیە ••! خۆ (ئەدموندز)و

دام‌ودەزگاکەی هەزارویەك شێوازیان هەیە بۆ تەشەند پێدانی ئەم نەخۆشیە •• بۆ کارتێکردن لەمێشك‌و بیرکردنەوەی کەسانی سادەو ساویلکەو ئاڕاستەکردنیان بۆ ئەو مەبەسەی کەخۆیان دەیانەوێت ، سەرەڕای ئەوە ، کە کەسانی لاسارو ، لاجلەوو ، هەڵمەتەکاسە لەڕووی ڕەوشت‌و خووەوە (الاخلاق) بەرامبەر بەم نەخۆشیە فیکریە وەیا (پەتا)بە بەرگە ناگرن‌و مەناعەیان ( Immunity ) نی‌یە • تەنانەت مستر (سی‌ەجی‌ەئەدمۆندز)و هاوکارانی گوێ‌گرەوەکەیان بە دەستەوە بو ، چونکە خۆیان میری‌و تەواوی دەسەلات بون بکوژو بڕ هەر خۆیان بون ••! پێشتریش باسمان‌کرد کە چۆن پۆلیسەکانی ئەوسای سەرگەڵو بەشداری ورووژانی (هەقە)کانیان دەکردو لەمانیش بە جۆش‌تربون ••! ئیتر هاندان وجولاندن،و دڵخۆشی دانەوەش لەسەروو هەمویانەوە ••!!

بزڕکاندن‌و ، وڕێنە ، وەیا (شطحات) هەروەکو دیمەنێکی ناساغی فیکری (ئایدیۆلۆجی) ! بەلەسەبون‌و لەڕست دەرچونێکە لەو پەیوەندایەتیە فیکری‌یەی کە ئەندامانی بزوتنەوەکە ، بەیەکتری‌و بەمەسەلە فەلسەفیە سەرەکیەکەیانەوە دەبەستێتەوە ، ئیتر زۆر ڕۆیشتن‌و بەرەلایی تیایدا •••، وەیا توندگرتن‌و دەست‌داگرتن لەم پەیوەندایەتیە فیکریەو جۆری بیرکردنەوە لێ‌ی ، لەگەڵ دەربڕینی ، وەکو هەڵوێست وڕەوشتێك ، بەتایبەتی لەقوناغێك وبارو دۆخێکی دیاردی بزوتنەوەکەدا ئەم بەلەسەو بەرەلاییە پەیدا دەبێت •• هتد شتێکی ئاشکرایە ، ئەندامانی بزوتنەوەکەش ـ هەربزوتنەوەیەك بێت ـ لەڕادەو (مستوی)ی بیرکردنەوەو فیریاندا چون یەك نین ، خۆ کوردەواری خۆیشمان وتویانە : پەنجەکانی دەستیش وەك یەك نین •• هتد ، ئنجا ئەم (شطحات)و بزڕکاندن‌و وڕێنەیە هەر تەنها لەمەسەلەی تەسەوفدا نی‌یە •• گەرچی

مێژووی تەسەوف و وڕێنەکەرو (شطحات)وبیدعەت گۆیسەیرو مەزنی دیوە •• هەندێکیان بون بەقوربانی ئەم (بیدعەت) گۆیی و (شطحات)ە ، گیانی خۆیانیان لەپێناویدا بەخت کردوە ! ئنجا دوای ئەوەی کە کۆچی دوایان کردوە (ردی اعتبار)کراون ، وبە (أولياء)و پیاو چاك دراونەتە قەڵەم •• هتد تەنانەت گڵکۆکەیان بوە بەنزرگەو گڵەکەشی مایەی فەڕ وموفەڕك ••!! ئیتر وە نەبێت ئەم (شطحات و بزڕکاندن و ، وڕێنەیە ) تەنها دیمەنێکی تایبەتی تەسەوف بێت و بەس • بەڵکو لەبزوتنەوەو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیشدا بوونی (شطحات و بزڕکاندن ، وڕێنە ) شتێکی ڕەمەکی و ئاساییو (عادة) هەیە ، ئەوەتا دیمەنی جڵەوشل گرتن و زۆر ڕۆیشتنەکەی لەبیروڕادا بەچەپڕەو Left وە توند گرتنەکەشی تا ڕادەی تاساندن و فلیقاندنەوەی !! بە بەڕاستڕەو Right ناو دەبرێت[1] • بەڵام هاندەری دەروونی (سایکۆلۆجی) وەیا هۆی بنەڕەت لەبزڕکاندن و (شطحات)دا • چ لەتەسەوف و ، چ لە (لادانە) ڕاست ڕەو وچەپڕەوەکەی لەمەڕ ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا بێت دەگەڕێتەوە بۆ :

١ ـ تێنەگەیشتن و پەیپێنەبردنی ، هەندێك لەکەسانی سەربە بزوتنەوەکە ، لە وردەبابەتەکانی ڕێڕەوی مەسەلەکەیان کەوا ئەندامێکن تیایدا •• هتد •

٢ ـ بێزارو ، وەڕس بون لە درێژە کێشان ، وخایاندن ، وبەتەمابون لەگەیشتن بە ئاواتی دێرین و ئامانجی دوا مەنزڵدا •

٣ ـ هەست کردنی هەندێك لەکەسانی سەر بەبزوتنەوەکە •• ئیتر

---

(١) ئەم دوو زاراوەیە ( چەپڕەو ، ڕاستڕەو ) لە شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ی فەرەنسەوە پەیدابوون •

سەبارەت بە لێهاتویی خۆیانەوە بێت ، یان هەست کردنەکەیان جۆرێك بێت لە خود پەسندیو نەرجسیەت

و بەخۆدا ڕاپەرمون •• کەگوایا لەناو بزوتنەوەکەدا ، پلەی جێوشوێنیان نزمەو حەقی خۆیانیان نەدراوەتێ •• ئەمە هەر وەکو ئەنجامێکی چەوت (نتيجة سلبية) لەبەکار هێنانی لێهاتوویی وزرنگیەکەیان ••! بەڵام کۆمەڵگەکانی ئادەمیزاد هەر چەندە بچوكو تەنگەبەریش بن • داب‌ودەستورو پەیڕەو ، وەیا (مەرکەزیەتێکی) خۆیانیان هەیە کەلەناخی فەلسەفەکەیانو بیروڕاکانیەوە هاتوە •• لەهەمان کاتیشدا (سەنگیمەحەکە) چالاکیو جموجوڵی کۆمەڵگەو ئەندامەکانی پێتاقی دەکرێنەوە ، پێی ئاڕاستەو ئامۆژگاری دەکرێتو لێیان دەپرسرێتەوە ، کەدەرچون لەو (مەرکەزیەتە)و دەستورو پەیڕەوەکانی ، دەرەچونە لەکۆمەڵگەکە تێکڕا ••! بۆیە بزڕکاندنو ، وڕێنە (شطحات) ، وەیا لادانو (انحرافات) دروست نییە ، کەچی دروستیش دەبێت ••!

٤ ـ وەیا جێوشوێنەکەیان لەقەبارەی توانای خۆیان زیاترە •• یا وەهای دەبینن ! ئەو ساڵە خۆیان باییو باغر دەبن ••! زمانی حاڵیان کوردواتەنی دەڵێت : (ئەزم هەڵدەبەزم) ! ئەمە ئەگەر (شطحات) گۆگان وەیا (منحرف)و لادەر ،و لەڕیزدەرچوەکان بەسوسەیەك ، سوکەپەیوەندایەتیەکیان نەبێت ، بەهێسڵ وەیا بەتیرەیەکی دژ بەبزوتنەوەکەوە •••!

٥ ـ سەبارەت بەپەیدابونی کارەسات‌و بیروڕای‌تو •• هتد خاوەن بیروڕای باسکراو ، لەچارەنوسی بیروڕاکەی دەکەوێتە ترسەوە •! بۆبەرگریو پاراستنی (توندی دەگرێت!) ، ئەم توندگرتنەش لە

ئیعـــلانی (حوکمی عورفی) وەیا (حاڵەتی طوارء) دەچێت کـــە حوکومەتەکـــان لەتەنـگانەو مەترسیـــدا ، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان ، پەنای دەبەنە بەرو بەکاری دێنن •• بەم توندگرتنە ، بیروباوەڕە کەلــــە خەڵـکی دوور دەکەوێتەوە •• هتـــد دیارە بیروباوەڕیش چالاکیـەکی ژیرو بیـــری (عقل) ئادەمیزادە ••، دورخستەوەی لەخەڵـکی ، بەمـانا نەمانو فەوتاندنێتی • ئنجـــا لەمنەمانوفەوتانی بیرو ڕایەدا (چەپڕەو ، وڕاستڕەو) یەکدگیر دەبن بەواتەیەکیتر : ڕاستڕەو بە توند گرتنەکەی دەیتاسێنێ ، چەپڕەویش بەبەرەڵایەکەی بەقەڵبەیەکیدا دەداو هەڵی دەوشێنێ•!!

بـــەم بۆنەیەوە نابێت لەبیرمان بچێت ، سەبارەت بەوەی کـــە : بزڕکاندنو (شطحات) دەیا لادانو (انحرافات) هەردووکیان لەسەرچاوەو بنـەڕەتی فەلسەفیاندا جیـاوازنو لەیەکتری ناچن •• هەمـــان دەستور لەشێوەو چـۆنێ نیشیاندا هـــەر جیـاوازن ، لەبزوتنەوە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکـاندا ، تەجروبـەو تاقی کردنـەوەیەکی ، دیـاردی،و گشتی کۆمەڵایەتیە ، خەڵـکی بەچاك یان بەخراپ دەیبینێت ، بڕیاری لەســـەر دەدات ، چونکە کۆمەڵگە تاقیگە (المختبر) کەیەتی ! بەڵام لەتەسەوفـدا تەجرویەیەکی شەخسییە ، لــەو کەســـە بەولاوە ، کـەسیتر پەی پێ نابات ••!!

هـــەرچۆنێك بێت بزڕکـاندنو ، وڕێنەو لادان ، وەیا (شطحـاتو انحرافات) لەڕووی فیـــکرییەوە : بەرەڵایی ، وبەلەسەیی ، ولـــەڕێز دەرچونە ، ئەنجـامەکەشی بۆ بزوتنەوەکـــە ، نوشوستیو دووبـــەرەکی جیابونەوەیە ( Secession )، هەروەکو لەبابەتی (حمەسور)دا باسێکی دەکـــەین •••، ئیتـــر ئەوەی کەوتمان ، دەبێتە کەلێنوکەلەبەرێك

لەبزوتنەوەکەدا ناحەزو دوژمنانی ، لێوە بچنە ناوی‌یەوە ••• هتد خۆ ئەگەر بەتەن‌و لەش نەچن ، بەڵام لەڕووی فیکری‌و ئایدیۆلۆجیاوە ، بیروڕاو شێوەی بیرکردنەوەی خۆیانی دەدەنێ ، بەمەبەسی تێکدانی‌و تەپاندنی لەناوەوە ، تاکو هێرش‌بردنە سەری لەدەرەوەیەوە ئاسان بێت، وئەرکێکی وای نەوێت ••! بەڵام بەنیسبەت بزوتنەوەکەوە تێکڕا ، ئەوەیان گرنگە ، کەئایا دەست بەرداری ئامانجە سەرەکیەکانی بوە ، وەیا لەبناغەی بیروباوەڕە فەلسەفیەکەی خۆی بە (کردار) لای داوە ، وخۆی دۆڕاندوە یانە ••؟! لەمەدا بڕیاردان ئەوەندە ئاسان‌نی‌یە •! وەڵامەکەی لای وەخت‌و زەمان ئەو ڕووداوەکارەساتانەیە کە سەرجەم ، بەچاك یان بەخراپ کار لەئەنجام‌و چارەنوسی بزوتنەوەی ناوبراو،و «لادان»و جیابونەوەکەی دەکەن تێکڕا ، چ لەناوەوەی بزوتنەوەکەو ، لادانەکەیەوە •• چ‌لە دەرەوەیانەوە ••!! هەروەکو هەمو بزوتنەوەو لادان‌و جیابونەوەیەك لە (جیهانی سروشت)دا ، لەبارەی تواناو بەرگەگرتن‌و مانەوەیەوە ••! ئەگینە (بزوتنەوەکە) یان (لادان‌و جیابونەوەکە)ی یەکێکیان بەرەوگۆڕستان ، وەیا وەکو زاراوە سیاسیەکە دەڵێت ، بێ‌غەم‌و پەژارە : «بەرەو سەرەنوێلکی مێژوو دەچێت» ••!

خۆ ئەگەر (هەقە)کان ویستبێتیان‌ژیانی دنیای ڕوون‌یان تۆزێك ڕووناکی تێدابێت ـ بەکردار نەك بەگفتار ـ هەروەها جۆرێك لەهاوبەشی‌و تەبایی‌و یەکسانی‌و هەرەوەزکاری باڵیان بەسەردا بکێشێت‌و حوکوم فەرمابێت لەناویاندا ••• ئەمە هەرگیز لەخوا یاخی‌بون نی‌یە ، وە لەم ڕێبازەشدا ئەگەر سکاڵایان کردبێت‌و درکاندبێتیان کە خوابەرداری نی‌یە ، زوربەی زۆری خەڵکی لەبرساندا قوڕەی سکی بێت ، وەکەمایەتیەکیشیان لەتێریدا مرەی بێت !! وەیا ئەگەر کارێکی وایان

کردبێت ، کە کەسیان یەخەی خۆی لەدەست هەژاریو نەبونی دانەدڕێت ..! وەیا بەدەست کێشەی دنیایانەوە دانەمێنن‌و لەکوردەی هەردوو جەژنان نەبن ..! خۆ پێغەمبەریش (د.خ)فەرمویەتی : ( کاد الفقر ان یکون کفرا ) ! ـ گولستانی سعدی ـ ، ئەو هەژاریو ئەو بارەناڵەبارە ، کە ڕەگی هەموشتێکی پێوەیە .. هتد ، ئیتر تێکۆشان بۆ ڕزگاربون لەم بارەناهەموارە ، هەرگیز سەرپێچیو لادان نییە لەئاین‌و بڕوا خۆ ئەگەر خوانەخواستە ، ئەمە سەرپێچی ولادان بێت ، ئەوسا ئاین‌و بڕوا بەجووت دەبن بەیارویاوەری : هەژاریو ئاتاجیو ڕەجاڵی ، وبەندایەتی ..! بەم پێوەدانەش هاوبەشیو یەکسانیو تەبایی ، هەرەوەزیو ئازادی تێکڕا دەبنە دوژمنی ئاین‌و بڕوا ، وەیا ئاین‌ویڕا دەبێ ببێتە دوژمنی ئەوان ..!! ـ والعیاذ باللە ـ ئیتر ئەگەر کوردەواری خۆمان ، وتبێتیان : (برسێتی ڕەگی هاریو هەژاریش ڕەگی گولی پێوەیە ) !! بەهەڵەدا نەچون ، ئەو هەژاریەی کەکار لەبیروباوەریش دەکات ، هەر وەکو کابرا هەجیجیەکەی کەسکاڵای لە دەست هەژاری کردو وتی :

خوا گەدابای ... خوا گەدابای ،
هەفتەودوهەفتە چون من گەدابای ،
هەمانە لەکۆڵ ، کڵاش لەپا بای !!
چێوی گەدایت گرتایە جە دەس ...!
ئەوسا ئەتزاتی حاڵی گەدا چەس ..!

دیسانەوە سەرگورشتەکانی (کفر احمد) کە کابرایەکی ئەفسانیەییە (شخصیة اسطوریة) ، ئەو چیرۆک‌و (سەرگورشتانەی ئەو) کە دەماودەم بەسەردەمی خەڵکەوەیەو بڵاو بۆتەوە .. لەگەڵ هەندێ لەهۆنراوەکانی

(وەلی‌دێوانە) ئەمانە نمونەیەکن بۆ چۆنێتی هەستی ناسۆری نەهاتی‌و کوێرەوەری‌و باشەلەقەکانی هەژاری ..!

لەم باسەدا تاکو سەرەداوی فیکری بابەتەکانمان لێ وون نەبێت‌و نەئاڵۆسکێت وەئەوەندەی لەتواناو بێت بتوانین شتێکی پوخت لەکێشەوبەرەی کۆمەلایەتی لە لێکۆڵینەوەیەکی ڕاست‌و دروست لەبارەی (هەقە)و (هەقەیەتیەوە) پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز بکەین . تاکو پەنجەی خەتاوتاوان بۆ هیچ لایەك درێژ نەکرێت لە مستر (سی.جی. ئەدموندز)و هاوکارانی بەو لاوە ..! ئەو هاوکارانە کە شوێن پێی ئەمیان هەڵگرتبو ، چ لەزانینەوە بوبێت ، زانینێك کەوا بەندە بە بەرژەوەندیانەوە ، یان بێ ئەوەی کە خۆیان بزانن‌و هەست‌کەن بەرژەوەندیەکەیانی پێوە بەندە ... هتدا چ لەلاساری‌و سوربونەوە بوبێت لەسەر نەزانین بەئەنقەست ، کە لەئەنجامدا بوبونە پردو بەردەباز بۆ پەڕینەووەی «پیلان» بۆسرەواندنە (هەقە)کان بە ناهەق ..! وەیا سوکە بەشداربونێك بوبێت لەبەر خاتران ! بۆ ڕسواکردنی (هەقە)کان لەناو کۆمەڵگە فراوانەکەی کە تیایدا دەژین ..، ئەم هەوڵ‌و تەقەلایانە سەرومڕ ، دەڕژانە دۆڵیاتی ئاشی ئەو پیلان‌و دەسیسانەی کە بۆ ئەم (هەقە) بەسەزمانانە لەکاردا بو .. ئنجا ئەم هەلۆیستە دوژمنکاریە جۆربەجۆرانە ، تێکڕا لەگەڵ کردوکۆشی مستر (سی.جی.ئەدموندز)و، وردە ئینگلیزەکانی‌تر کە بۆبەرژەوەندی ولاتەکەی خۆیان ڕوویان کردبوە ئەم ولاتە ، کەتیایدا بوبونە پیاو ماقوڵ‌و ڕوشنبیرو کوێخاو ئاغا ..! یەکی دەگرتەوە ..

تەنانەت خاتو (هێنی هارۆڵد هانسن) لەکتێبەکەیدا کە بەناوونیشانی (ژیانی ئافرەتی کوردە)و مامۆستا ( عزیز گەردی ) لەئینگلیزیەوە کردوویەتی

بەکوردی لەلاپەڕە (٣٤٦ – ٣٤٧ )دا ، هەمان قسەکەی مستر ( سی•جی•ئەدموندز )بە ( هەقە )کان دەڵێتەوە • خۆ ئەگەر ( ئەدموندز ) هەروەکو سیاسی یەك شتێکی تێداهێشتبێتەوەو زۆر نە هاتبێتە پێشەوە ، تا ڕێی پاشەکشێی هەبێت ••! بۆیە دەبینین تەنانەت ، تێبینیەکانیشی لەبارەی ( هەقە )کانەوە دەداتە پاڵ ئەو پۆلیسانەی کەچوبون بۆ ( هەڵەدن )بۆ تەبلیغات •• لاپەڕە ( ١٨٧ ) – کتێبی ( کرد ، ترك‌وعرب ) •••

بەڵام خاتو ( هێنی ) کەبە زمانی مستر ( گاوان )ەوە دەی گێڕێتەوە ، بێ‌چەندو چون ، خوالێ‌خۆشبو ( حاجی شێخ‌عارف ) دەکات بەسەرۆکی پەیڕەوی ( ڕووتی – بەرەڵایی ) ئەو بەرەڵاییەی کەوا ( هەقە )کانی پێ تاوانبارکراوە •••، ئەم ( سەرۆکایەتیە ! ) دەداتە پاڵ ، ئەو ( حاجی شیخ عارف )ەی کە باوکی خوالێ‌خۆشبو ( شیخ‌تەیفور )ی خانەخوێ کەی خۆیەتی ••! کە لە « تۆپزاوا »و ئەو ناوچەیەدا ( شیخ‌تەیفور ) چاوساغ‌و دەلیلی بوە ••!

لەمەدا بەنیسبەت ئەم ئافرەتەوە ، ئەگەر خزمەت‌و نان‌ونمەکی لێ دەرکەین کەوا داب‌و دەستورێکی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتیەکانە ، کە لای ئەوان شەپقە داگرتنێك! وەیا بەچەند وشەیەکی سوپاسنامەی سەرزارەکی کۆتایی بێت‌و ئیتر هیچیان لەهیچ !! بەڵام دووبارەکردنەوەی وتەکانی ( ئەموندز/گاون ) لەبارەی ( هەقە )کانەوە بێ‌چونەبنج‌وبناوان‌و لێکۆڵینەوەیەکی یەکی عیلمی ••، جنێوێکە بێ‌پەروا ئاراستەی باوکی خانەخوێ کەیی کردوە ••! لەکاتێکدا ئەم ( خاتونە ) گوایا بەگەشتێکی زانیارانە ( سفرة علمية ) هاتبوە ناوچەکەیان ••!

لەم کەلێنەوە بۆمان هەیە کە بڵێین : ئەگەر وەکو مستر ( ئەدموندز / گاون ) دەڵێن‌و ئەمیش دەی‌ڵێتەوە ، ئەگەر خوالێ‌خۆشبو

( حاجی شیخ عارف ) داهێنـەری ڕێبـازی بەرەڵایـی بوبێـت لەنـاو ( هەقە )کاندا ـ لەگەڵ تەواوی ڕێزمدا بۆ ئەم زاتـەو کوڕوکـوڕەزاو ، وەچەکانی چونکە ئەمە بیروڕای ئەو دوانـەو دەسـتوپێوەندەکانیانـە ، ئەمە وا دەگەیەنێت ، ئەم زاتەو ئەوانەی پەیوەندیان پێوەی هەبوە خاوەنو نوێنەری تەوژمی ( تیار ) ، بەرەڵاییو ، بەرەڵاییخوازی بون لە ڕیـزی ( هەقە )کاندا ••! ئیتر بۆچی ئەم بەرەڵاییە بەسەربەرەی خوالێخۆشبوان ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەو ( مـامەڕەزای ) برابدا ساغبکرێتـەوە ، لەسەرئەمانو لەسەر هەمو ( هەقە )کان بکرێت بەماڵ ••؟! بەڵام وادیارە مەترسی لەمەسەلەی ( هەقە )دا ، لەلایەن بەرەی خوالێشبوان ( شـیخ عبدالکریـم / مامـەڕەزا )وە ڕووی کردبـوە پاشـەڕۆژی دەسـەڵاتی ( ئەدموندز/ گاون )و دەسـتو پێوەنـدەکانیان ، نـەك لەلایـەن بەرەڵاو بەرەڵاییخوازانەوە ، بۆیە لەبەد گۆییو پرۆپاغەندەکردندا دژی (هەقە)کان بەگشتی دەستیان دادەگرتو دەمیان نەدەسرەوت ••! بەکورتـی بەهـۆی بەرەیەکەوە شانی هەمویانیان ئارداوی دەکرد •• بەواتەیەکیتر کردەوەی بەرەیەك ـ درۆ بێت یان ڕاست ـ کردویانە بەنمونە ، وەیا ( پێخۆر ) ! بۆ سوكوڕسواکردنی هەمـویان ، بەوبەرەیەشـەوە ، کـە ئاشـناو ڕۆشـناو چاوساغیانن ! ئاوها پاداشیان دەدەنەوە ـ بەش بەحاڵی خـۆم لەوباوەڕەدام کەئەو تێبینیانەی ( خاتوهێنی )ش ، لەم ڕووەوە فڕی بەسەر حەقیقەتو ڕاستیەوە نیيە ••! ـ تەنانەت سەربەسـتی ئافرەتیشـی خاتـو ( هێنـی ) بەژنبەرستی دەداتە قەڵەم ، بۆیە سەربەستی ئافرەت لەناو ( هەقە )کاندا وشەو ڕستەیەکی نابەجێی دەداتێ ••! ئایا ئەمانە لە وڵاتەکانی خۆیاندا دەتوانن ئەمکردەوانە بنوێننو نەبن بەبابەتی لاقرتیو تانەوتەشەری خەڵکی وڵاتەکەی خۆیانو ڕای گشتیان ••! نازانم چۆن بوە کە بارودۆخی ئافرەتە ( هەقە )کانیان نەکردوە بە ئافرەتە ( ئەمەزۆن )یەکان ، کەبە پیاو بەزێـن

جۆرەها چیرۆکیان بۆ هەڵبەستون ..!

هەر چۆنێك بێت ئەم خاتونە بەکەشتێکی زاتیارانە ( سفرة علمیة ) هاتبو دەیتوانی بۆئەو ژنپەرستیە » مشتێك وە یاچەند نمونەیەکی (عینات) لێ بهێنایەوەو پێشکەشی بکردایە .. بەتایبەتی دانەری کتێبەکە ، ( ژیانی ئافرەتی کورد ) ، خۆی ئافرەتە بەئاسانی دەیتوانی بچێتە ناو وردەبابەتی باسەکەیەوە ، بێ ئەوەی لەخۆیەوە قسە فڕیبدات ، وەیا بەڕاپورتەکەی ( ئەدموندز ـ گاون ) دابچێتەوە ..! خۆئەم ( خاتوهێنی )یە تا لەباسەکەیدا سەرکەوتوبێتو دانەمێنێت ، بەدوای دەنکە مورویەکی بێکونیشدا گەڕاوە ... بەڵام ڕەنگە لەوە ترسابێت کە نمونەکان ( عینات ) بەدڵی دۆستانیو دەزگاو دوکانی (کالسیرك)و (ڕاسکوسنێد)[1] نەبن کەوا بەهەمو بارێکدا باربوویان کردوەو ، یارمەتیان داوە ، ئەم جوتە دەزگاودوکانە کەلە پەنای عیلمو بەناوی ( اثنوگرافیا )وە ئەرکێکیتریان لەسەرشانەو بەئەنجام دەگەیەنن ، دیارە ئەم خاتونەش لەڕەسەنو بنەچەی سیاسی ( ئەدموندز / گاون )ە کوردواتەنی : ( توخمەتخیلێ )یە ... ئیتر کاری مامۆستا ( عزیز گەردی ) ڕاست بێت کە وا لە لێبینیەکانیدا لاپەرە ( ٣٤٨ ) ـ هەمان سەرچاوە ـ باریلاسەنگی ڕاست کردۆتەوە ..

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم گێرەشێوێنیە کە ( گایبنە ) تیایدا ..! پیاوانی بێگانەی داگیرکەرو کەسانی سەربەوان بون ، کەوا لەمکارەساتەو گەلێك کارەساتیترو ( دزەخورجێنە )ی ! سیاسیو کۆمەلایەتیدا ئاڕاستەکەر ( موجە )بونو دەستێکی بالایان هەبوە تیایدا ..، تەنانەت

---

(١) تەکایە بە وردی تەماشای ئەوپێشەکیە بکە کە خاتو ( هێنی ) خۆی لە کتێبەکەیدا ( ژیانی ئافرەتی کورد ) نوسیویەتیو مامۆستا ( عزیز گەردی ) کردویەتی بە کوردی .

( شیخ حسین )ی خانەقا ، لەلاپەرە (٥٩) پەراوێز (٦٣) ـ ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ـ مصطفی عسکری ، بێ پەرواو ئازایانـە دەڵێـت :
( لەوڕۆژەوە کە ڕێبـازی کۆمەڵایەتـی لەنـاو هەقەکـانا دەرکـەوتوە ئینگلیزەکان لێیان کەوتنە ترسەوە ، ئیتر هەرچیان بەسەرا هات دەستی ئەوانی تیابو ... م . م . ك ) ـ تەواو . ئایا ڕێبازە کۆمەڵایـە تیەکـەی ( هەقە )کان دەبێت چی بێت کە ئەوان لێی ترساون ..!؟ هەرئەوە نەبوە کە : ـ ویستویانە بەشێوازو ڕێبازو ڕێبـازی : ( یەکسـانیو تەبابـیو هاوبەشیو ، هەرەوەزکاری .. ) لە نەبونیو هەژاری ڕزگاریان بێت ! خۆ نەیانویستوە ، ڕژێمی کۆمەڵایەتیو سیاسی لەدورگـەی بەریتانیـادا بگۆڕنو ( هەقە )یەتیان بـۆ بنێرن ..! ئیتـر بۆچـی لێیـان کەوتنـە ترسەوە ..؟ بەڵام وادیارە مەترسـیان لـە ( مشـتەی ناو هەمانەکـە ) ، لەیەکسانیو تەبابیو هاوبەشێتییەکەی لەمەڕ ( هەقە )کان هەبوە ، کەوا بۆ بارخانە نەوتینەکەیانو سامانەکەی زیانی هەیە ..!

ئیتر بۆ دەرخستنی حەقیقەتو ڕاستی لەم مەسەلەیەدا ناچار دەبم ، کەجاروبار هەندێ فیکرە ، بگرە هەندێ ڕستەش دووپات بکەمەوە ، بەم بۆنەیەوە داوا لەخوێنەری بەڕێز دەکەم لێم ببورێت ، چونکە وەکو دەڵێن : ( قسە قسە دێنێت ..! ) سەرەڕای ئەمەش کارەساتو ڕووداوە مەزنەکان ، لەکۆبونەوەی وەردە بابەبەتە لەیەكچوەکان لەبارەی چۆنێتی یانەوە ، پەیدا دەبێت ... هتد لە ئەنجامی ئەم ( جەمعوتەرح )و کردارە ماتماتیکیە بە سەر ژیانی کۆمەڵایەتیەوە ، تێکڕا ژمارەی ناکۆکـی ( التناقضـات ) وردە بابەتەکانی بارە ناهەموارەکە زیاد دەکات ، بەرامبەرەکەشی واتە گـۆڕانو کارەساتە مەزنە داهاتوەکان ـ خـۆیان کـۆ دەکەتـەوەو ناکۆکیەکانیـان کەمدەبێتەوە ، بەکورتی ( کۆكتر ) ! دەبێ ئەوسا ئەم زیادوکەمییە ، ئەم گۆڕانکاریە لەچەندایەتی ( الكمية )یەکەیدا ، کار لەچۆنێتی ( الكيفية )

مەسەلە کۆمەڵایەتیەکە ، تێکڕا دەکەنو دەی گۆڕن بەبارێکی تردا ، کە بۆژیانو مانەوەو پێشکەوتنی بەرەی ئادەمیزاد سودێکی هەیە ..!

بۆ نمونە :ـ شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان لەژمارەیەکی بێشومارو زۆری ( وردەبێزاری ) ناوخەتکیەوە پەیدا دەبێت ..، ( بێزاری ) لەو کردەوانە ، لەو بارە ، کە ( هەڕەشە )لە ژینیان دەکاتو ژیانو گوزەرانیان ، دەخاتە مەترسی فەوتانەوە ..! ئەنجا بۆ ئەوەی وێنەیەکی ڕاستەقینە لەواقیع پێشکەش بکەین ، تۆزێك لەباسەکە لا دەدەین ـ تکایە لێمان ببورن ـ چونکە لادانەکەش نیمچە پەیوەندیەکی بەباسەکەوە هەیە ولایەنێکی ڕوون دەکاتەوە .. هتد .

دوای ئەوەی کەئینگلیزەکان سەرکردایەتە ( هەقە )و شێخانی سەربە ( هەقە )یان بۆ هەڵنەخەڵەتاو ، بۆیان لاس نەدرات ئەمانیش خوا هەڵناگری بەئارەزووی ئەوان نەبونو کوڕنوشیان بۆ نەبردن !!، ئنجا هاتن لەژێرەوە ، لەناو ڕیزی ( هەقە )کاندا کەوتنە کار بۆ ڕسواکردنو پیشاندانیان بە جۆرێکی ناشیرینو نەشاز ..! ئەوانەی ئەم دەورانەیان دەبینی هیچیان خەڵکی دورگەی بەریتانیاو ناوچەی ( وێلزو ، ئیسکوتلاندە ) نەبون ، وە هیچ پەیوەندیەکی ڕاستەو خۆیان بەئینگلیزەکانەوە نەبوە ، بەڵام ئەمان تەنها سودیان ، لەلایەنێکی چالاکیو ائێهاتوویان وەرگرتوە ، لە چالاکی زاتیو شەخسی ( Ego ) ئەو کەسەی کەلەناو ڕیزی ( هەقە )کاندایە ، وەیا دوورو نزیك پەیوەندی پێیانەوە هەیە ...، ئەم لایەنەیان بۆ مەبەستی خۆیان پەروەردەو بە خێو کردوە ..! وەیان هاتون ، ناکۆکیە سادەکانی ناویان ، ئەو ناکۆکیانەی کەلە هیچەوە دیارنییەو ، جێی هیچ ناگرێت ! زلو ئەستوریان کردوە بەجۆرێك کردویانە بە دەلاقەیەکی گەورە ، وەیا وەهایان پیشان داوە ،

تا لەیەکتریان تیژکەن بیانکـەن بەگـژ یەکـدا ، بەتایبەتـی بەگـژ سەرکردایەتیەکەیاندا ..! خـۆ ئەگـەر هـەوڵو کۆششـیان لەگـەڵ خوالێخۆشبو ( حاجی شیخ عارف )ی سەرگەڵودا سەری نـەگرتبێت ، سەبارەت بە ژیری‌و دوورئەندیشی ئەمزاتەوە بوەو خزمایەتیەکی نزیکی لەگەڵ خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەدا ، لەگەڵ گەلێـك هۆی تریش ، کە لەوانەیە شەخسی ڕووت بوبن ، بەکەڵـکی نانـەوەی دووبەرەکی نەهاتـون ، وەیـان ئەنجامێـکی پێچەوانەیـان دەبـو ، لەکەرتکردن‌و دووبەرەکیەکەی کە دەیانویسـت ، ئـەو دووبەرەکیەی کە بەکەڵـکی ئەوان بێت‌و خزمەتیان بکات ..!

بەڵام لەناوڕیزی ( هەقە)کاندا هەیە بۆ ئەم مەبەسە بشێت‌و سەری پێوە نەبێت ، ئەمە لەلایەك ، لەلایە کی‌تریشەوە ، کە ئەم لایەنە یەکسەر پەیوەندی بە چۆنێتی ڕێبازی (هەقە )کان‌و ئەونەریت‌و پەیڕەوەوە هەیە ، کە لە ناویاندا حوکوم فەرمایە ، ئەمیش ئەو یەکسانی‌و تەبایی‌و جـۆرە دیموکراتیەتەیە کەلە ناویاندا هەیە ...، چونکە جیاوازیەکی ئەوتـــۆ نی‌یە ، لەناو پیرو مریدەکانیاندا ، کە شایانی باس بێت‌و پەنجەی بـــۆ ڕاکێشرێت ، کە ئەم ڕەوشتە لەناو ڕێبازە کانی تری تەســەوفدا بـەدی ناکرێت .. ! دیارە مشورخواردنیش بۆ ئەم ئیشمە ، بۆ دووبەرەکـی‌و ئەرکەکەی ، پێویستی بەتێبینی‌و لێـکۆڵینەوەو دەراسەیەکی قـووڵ‌و فراوان هەیە ، کە زۆر دەمێك بو کردوکۆشێـکی تایبەکاری بۆ تەرخان کرابو ، ئیشی ڕۆژێك‌و دوان نەبو .. تاکو دەسـتنیشانی پاڵەواتـی لێهاتوی کارامە دەکرێت بۆ ئەم ئەرکە بۆ ئەم قۆناغ‌و هەڵوێستە ، کـەوا هەمو هەل‌و مەرج‌و مواصفاتێـکی تایبەتی‌و شەخسی بۆ ئەم دووبەرەکیە تێدا بێت ..!

## ( ١٣ )

لەم بارەیەوە سەرچاوەیەکی وامان نییە کەیارمەتیمان بدات ، بۆ لێدوان لە کێشەی جیابونەوەو دووبەرەکیو کەرت کردن لەناو ( هەقە ) کاندا جگە لەکتێبەکەی مامۆستای پارێزەر ( مصطفی عسکری ) ـ ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ـ لەگەڵ نوسینەکەی مامۆستا ( رشید محمد علی ) کە لە گوڤاری ( کاروان ) ژمارە (١٥) کانونی یەکەمیساڵی ١٩٨٣ کە بە ناوونیشانی ( مەسەلەیەکی مەزنو هەوڵێکی کەم ) بڵاوکراوەتەوە ، کەوا هەردووکیان بەجوت باسی پەیدابونی ( حمەسور ) دەکەن لەبزوتنەوەی ( هەقە )دا ، هەروەها بۆ لێکۆڵینەوەو دەراسەی ( حمەسور )یتی ، هیچتر ـ ئاشکراو دیاردی ـ شك نابەین لەم دوو سەرچاوەیە بەولاوە ... بۆیە دەبینین ناچارین لێدوانو گفتوکۆو ، شیتەڵ کردنەوەو چەندوچونمان ، هەر لەسەربنچینەی ئەو ، وتو وێژانەیە کە ئەم دوانە لەم ڕووەوە کردویانە .

پێش ئەوەی ، کە بچینە ناو باسەکەوە ـ هەروەکو لەدەرگادانێك ـ چەند پرسیارێك دێتە پێشمەوە : ـ حمەسور کێیە ..؟! لەبزوتنەوەی ( هەقە )دا پێش جیابونەوەی ڕەوشتی چۆنبوە ..! دوای جیابونەوەکەی،

ئەو بەرەیەی کەئەم بوبە پیروپێشەوایـان دابو دەسـتورو ڕەوشـتیان چیبو ...؟! وەڵامی ئەمپرسیارانـە تا ڕادەیـەك ڕووناکیـەك ئاڕاسـتەی ئەنجامی کـەرتکردنەکـە دەکـەن ، چ کێیە ...؟! لەبزوتنـەوەی ( هەقە )یەتیەوە ...، چ بەنیسبەت چارەنوسو پاشەڕۆژی جیابونەوەکەو خودی کەرت کردنەوەکەوەوە ....!

( حمەسور ) پیاوێـکی نەناسراوبوە ، نەناوی باوکی دیارە ، نەهی باپیریشی ، هەروەکـو لەلاپـەڕە ( ٣١ ) ـ لەکتێبـی ئاوڕدانەوەیـەك لەبزوتنەوەی هەقە ـ دانەری مامۆستا ( مصـطفی عسـکری )دا هاتـوە ، گوایا خەڵـکی ئالانو سیوەیلە ...، دیسانەوە مامۆستا ( رشـید محمـد علی )یش لەنوسینەکەیدا ـ گوڤاری ( کاروان )ژمارە (١٥) کانونـی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ لاپەڕە (٧٠)دا دەڵێت : ( حمەسور ) خۆیو تویەتی کە خەڵـکی دەوروبەری ( مـاوەت )ە .. ئیتـر ( حمەسـور ) خەڵـکی هەرلایەك بێت ، لە ڕێڕەوی ژیانو گوزەرانی تایبەتی خۆیدا ، بەوەدا کـە باوكو باپیری ، بێناو ، و نەناسراون ، وا دەردەکەوێت لەسەرەتادا ژیانێکی پڕستەمو کڵۆڵ ژیاوە ، بە تایبەتی لـــە تافی منداڵیدا ، ئـەم مـاوەیەی بەکوێرەوەریو سەرگەردانی بردبێتە سەر ، تا گەورەبوەو ئێسقانی ڕەق بوە ..! لای خوالێخۆشـبو ( شـیخ عبدالکـریم )ی شەدەڵـە خـۆی گرتۆتەوە ، لەوێ چەپو ڕاستی خۆیی ناسیوەو چاوی کراوەتەوە ! ئەم تەمەنە منداڵیە پڕ ستەمو مەینەتی یەی ( حمەسور ) وەنەبێت خەوشێك بێت بۆی ، بە ناشوکوری ناڵێم منداڵی بەختەوەر کەمە .. کەچی بەپێچەوانەوە منداڵی کەساسو وکوڵۆڵ زۆرو زەبەندەیە...! بە تایبەتی لەلادێکانماندا، کە ڕژێمی دەرەبەگایەتی دەسەلاتدار بو ، ئیتـر نەخۆشـیو مەینـەتی کۆمەڵایەتی ، دەقێكو چوارچێوەیکی ڕەمەکیو ئاسـاییو عادەتی بـو ، کەمکەس هەبو لەبینینی منداڵی شبڕۆڵەو کۆڵۆڵو پەرێشان دڵی ڕانەچڵەکێت!

سەبارەت بەم جوتە نەگبەتیە : هی نەخۆشیو هی کۆمەڵایەتی ! بەشێکی زۆر لەمنداڵی بەسەزمان ، هەر بەساوایی هەتیوو ، بێ کەکەسو قەڵەندەر دەبو ..! هەمیسان بەناشوکوری ناڵێم ، ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆش نەبو ، کە چاودێری منداڵی لێقەوماو بکات ، ئامۆژگاریو پەروەردەکردنی بخاتە ئەستۆی خۆیو دەستێك بێنێت بەسەریداو بێکەسی پێوە دیار نەبێت تاگەورە دەبێتو لە خەم دەڕەخسێت ..! دوور نی یە لەناو ئەم منداڵانەدا ( کەڵە فەیلەسوفو داهێنەرو ، ڕۆشنبیرو ، وێژەوانی بلیمەت هونەرمەندی لێهاتویان تێدا نەبێت ) ! ئەگەر دەرفەتو هەلو مەرجی گونجاویان بۆ هەڵ بکەوتایە ..، بەلام بەنامۆیی ، بەسەرگەردانیو بەئاتاجی ، بێگومان بلیمەتیو لێتوویەکەشیان ڕوودەکاتە لایەنێکی نەگریسو نالەبار ( سلبی ) ، وەیا پڕوپووچ ..! خۆ ئەگەر ئەم منداڵانە بە داروبارو تەنولەش پتەوو قایم نەبونایە ، واتە لەڕووی بایۆلۆجی یەوە بەهێز نەبونایە ، بەرگەیان نەدەگرتو نەدەمانەوەو زوو جوانەمەرگ دەبوون ..! ئیتر ئەرکی ژیانو خۆ بەخێوکردنو هەڵسوکەوتو کەشمەکەشی ناو کۆمەڵگەشیان دەکەوتە سەرشانی خۆیان هەرلە شوانیکارەگەلو بەرغەلو گۆلکەوانیو ئنجا ڕەنجبەریو ئاشەوانیەوە پێدا دەهات تا دەگەیشتە بەردەرگی : « دیوەخانی ئاغاو بەگ ، یان تەکیەو خانەقای شێخەو مجەوری مزگەوت » ..!!

دیارە ژیانی کۆلۆلیو پڕستەمی سەردەمی منداڵی ، شوێنەوارێکی پڕستەمترو سەخت ، لەدەست سەردەمە پڕمەینەتیەکەی ، کە لە هەڕەتی منداڵیەکەیدا دیوێتیو چەشتویەتی لەدەروونی منداڵە کەساسەکەدا بەجێدە هێڵێت ..! وەکو برینێکی ساڕێژی شوێن دەمی تیغێك ، وەیا شوێن ڕووشاوی یەك بە ڕووکاری ڕەوشتو خوویەوە دیارە ، لەگەلێك بارو ، هەڵوێستو موناسەبەتدا خۆی دەردەخاتو دەردەکەوێت ..

لەشێوەی وەڕسیو بێزاریو ڕقویاخیبون بە هەســتوعاتیفەیەوە دیارەو خۆی دەنوێنێت ••• هتد چونکە ئەو بارو هەڵوێستو بابەتە ، کوێرەوەریە دێرینەکەی خۆیی بیر دەخاتەوە ، برینەکەی دەکولێنێتەوە بۆیە توخونی ئەو جۆرەبابەتە ناکەوێتو خۆی لەقەرەی نادت وەیا لەئاستی هەڵدێت ! ئەمە لەلایەك ، لەلایەکیتریشەوە ، ئەم منداڵــە کەساســو کوڵۆڵانــە ، سەبارەت بەوەی کە بە تاقە تەنیا زۆرانبازیــان لەگــەڵ ژیاندا کــردوەو بەسەریدا زاڵ ، جۆرە شارەزاییو خوبرەو تاقیکردنەوەیەکی تایبەتیار لا کۆ دەبێتەوە ، ئەمە جۆرێك لە هەستی بەخۆداڕاپەرمونو خودپەسندیو فەردیەت ، تەنانەت دەماری سەرپێچــیو یاخیبونیشــں ، لەدەروونیانــدا چەکەرە پەیدا دەکات ••!

ئنجا وا دیارە ( حمەسور ) لەڕووی سایکۆلۆجیەوە ، هەڕەمەیەك بوە لە ناکۆکیەکان ( التناقضات ) ، کە لە ئەنجامی ئەو هــەمو مەینــەتیو کوێرەوەریو کوڵۆڵیەوە پەیدا بوبون کەلە هەڕەتی منداڵیــدا گرفتــاری بوبو ، وەتیایدا ژیابو ••!!

( حمەســور ) سەرەتــای ژیانــی تەسەوفتیەکــەی لەخزمــەت خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵەدا بوە ، پێلاوی دەربەدەریو ئاورەیی ، بەرگی هــەتیوی لای ئــەم زاتەدا کــەندوە •• پێویستە بزانین ڕەوشتو کردەوەی لەم قۆناغەی ژیانیدا چۆنبوە ••!؟

مامۆستا ( رشید محمد علی ) دەڵێت : ( حمە سور )یەکان چایــان نەخواردۆتەوە • هەروەها لــەزەمانــی ( شــێخ عبدالکریــم ) خــۆیدا چاخواردنەوە قەدەغە کرابو •• هتد ( تەواو ) ـ گــوڤاری ( کــاروان ) ژمارەی ( ١٥ ) ساڵی ١٩٨٣ ـ •• ئەوی ئاشکرایە خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم ) لەساڵی ١٩٤٢دا کۆچی دوایی‌کردوە ، ئەمە وادەگەیەنێت

کەسێ ساڵەکەی پێش‌مەرگی ( شیخ ) لەو ساڵە شومانە بوە ، کە جیهان لەگەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بوە ••، ئەو ساڵە پڕمەینەتیانـەی کە خەڵـکی چایان بەخورمـاو مێـوژ دەخـواردەوە چونکـە بەهۆی جەنگەکەوە شەکر قاتی بو •• خۆ ئەگەر ( شێخ ) قەدەغەشی کـردبێت لەو باوەڕە دام کەئێشێکی باشی کردوە ، چونکە شیرینی تری خۆماڵـی هەبو کەوا جێـگەی شیرینی شەکـر بگرێتـەوەو تامـەزرۆی شەکـر بشکێنێت‌و لەمیش باشتر بێت لەڕووی خۆراکەوە ( التغذیة ) ••، بایزانین ( شێخ ) هەڵوێستی چۆن بوە ••!؟

مامۆستا ( رشید محمد علی ) لەهەمان سەرچاوەدا دەڵێت : [ بەڵام حمەسـور خۆی لـە باسی چانەخواردنەوەکەیاندا ئەڵێ : « ڕۆژێـکیان کۆمەڵێـکی زۆری سۆفی‌و شێخان لە تەکیە کۆبونـەوە منیشـں چومـە ژورەوە گوێم لێ‌بو « شێخ » ئەیفەرمو مریدی من نابێت چا بخواتـەوە ـ واتە حمەسور بەدەنگـی بەرز قیژاندم وتـم : « مـن دەیخۆمـەوە » شیخیش فەرمور : « شێتە لەگەڵ تۆم نی‌یە » ••• ] ـ تەواو ـ

ئەوی لەم هەڵوێستەی ( حمەسور ) دەوەشێتەوە : أ ـ « حمەسور » خۆی لە شێخ سور کرۆتەوە ، بەو شێوە ناشیرینە بەسەریدا دەشیڕێنێ‌و بەو جۆرە ناشیرینە بەربەرچی شێخەکەی ، مامۆستاکەی ( ئوستادە )کەی دەداتەوە • لەسـنوری وێـڵ‌و نەزاکـەت دەردەچێـت بەرامبـەری •• ب ـ لەپەیڕەوو فەرمانی ( ئوستادەکەی ) یاخی دەبێت‌و دەڵێت : مـــن دەیخۆمەوە ) ، کەچی ناشی‌خواتەوە ، ئنجا چاخواردنەوەشـں قەدەغـە دەکات ، ئەمە وا دەگەیەنێت کە ( حمەسور )لەو کۆمەڵەدا ویستویەتـی ( شیخ ) بشکێنێت ، بەڵام شیخیش ناڕەزایی‌و زویر بونی خـۆی لـــەو هەڵـگەڕانەوەی ئەو لەناو ئەو کۆمەڵەدا بە : ( شێتە لەگەڵ تۆم نـی‌یە )

چارەسەر دەکات ..! خۆ ئەگەر ( حمەسور ) ئەم کردەوەیەی بەرامبەر هەرشێخێکی تری ( ارشاد )بنواندایە ، لەو شوێنەداو بەو زەقی‌یە ، بێگومان وەڵامەکەی هەر ( شێتە لەگەڵ تۆم نی‌یە ) نەدەبو ...! بەڵام وا دیارە ( شێخ ) بەمریدی خۆیی نەزانیوە ، بۆیە لەگەڵ ئەوی نەبوە .. ـ ئیتر ( حمەسور ) مەگەر هەر خۆی بزانێت مرید ، وەیا ڕاسپێرراوی کێ بوە ..!؟ خۆ ئەگەر ڕاسپێرراویش نەبوبێت خزمەتی ڕاسپاردنی کردوە ..! وەیا بێ‌ئەوەی کە بە خۆی بزانێت کێڵگەی تاقیگەیەك ( حقل التجارب ) بوە ..!

لەبارەی ( حمەسور )ەوە مامۆستا ( مصطفی عسکری ) لەکتێبی ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقەدا ، لاپەرە ( ٣٢ ) کە بەزمانی مەلا سەلامی ترێخۆرەوەیە ، دەڵیت( کەشێتی پەیدابو حمەسور یەکێك‌بو لەشێتەکان‌و « شیخ عبدالکریم » بەشێتی‌یەکەی ئەو (؟) ڕازی نەبوە ... هتد ) ئەگەر شێتی‌و سۆفێتی لەو بارودۆخەدا ئامرازوئاوەڵی یەکتری بن ، وەیا ( دوو دیوی پارەیەك ) بوبن ..، هەرگیز ئەم کردەوانەی (حمەسور) سۆفێتی‌و دڵبەندی نەبوە بەشێخەوە ، ئەودڵبەندی‌یەی کە بەردی‌بناغەی نێوان ( شیخ‌ومریدە )و یەکەم‌هەنگاوە لەڕێڕەوی ( تەسەوف )دا ، هەر وەکو گوێڕایەڵی ( الاطاعة )وایە بۆ ( مەرکەزیەت ) لەژیانی حیزبایەتی وسیاسیدا ..! بۆیە ( شیخ عبدالکریم ) باشی ناسیوە ، تا هەقی نەبوە کەبە ( شێتی )یەکەی ، وەیا بە سۆفێتی‌یەکەی ( ڕازی ) نەبێت ..، وەیا سڵی لێ‌کردبێتەوەو گومانی لێ‌ی هەبوبێت ..!! وەیا شێتی‌یەکەیی بەشێتی‌یەك زانی‌بێت کە دەست لە ( عاقڵ )یش بوەشێنێت ! بەکورتی ( شێتی‌عاقل..ێ! ) بێت .

( حمەسور ) هەرچۆنێك بوبێت لەناو کۆمەڵگەی ( هەقە )دا ،

ئاوات‌و نیازی خۆیی نەشاردۆتەوە •• ئەویش ئەوە بوە کە بەمیراتـــی ( شیخ ) شادبێت ••• هتـد ئەوەتا لەلاپـەڕە ( ٣١ ) کتێبـی ناوبـراودا ( مامۆستا مصطفی عسکری ) بە زمـانی مامۆسـتا ( حمـزة عبداللـه )وە دەڵێت : ( حمەسور پاش مردنی شیخ عبدالکریم مێزەرەکەی لەسەر خۆی ئەنێ‌و جبەکەی لەبەر ئەکا ئیدیعای شێخێتی ئەکات ، بەڵام شێخەکان ملی بۆ کەچ ناکەن لەشەدەڵە دەری ئەکەن •• هتد ) ـ تەواو ـ

لەم هەنگامەدا ( حمەسور ) پاشەکشێی لێ‌دەکات ، چونکە بەتاقی تەنیا دەرقەتی ئەو داب‌و دەستوری کۆمەڵـگەیە نایـەت ، کە دەیەوێـت سەرومڕ خۆی بکات بەپیروپێشەواو شێخیان ، بـۆیە خـۆی‌و دەسـتەو تاقمەکەی ڕوو دەکەنە ( کلاوقـوت ) لـەوێ بە نامـرادی جـێ‌نشـین دەبێت ••، لەم بارەیەوە مامۆستا ( محمدی ملا کریم ) لەلاپەڕ (٣٢)هەمان کتێبدا باشی بۆ چوە کە دەڵێت : ـ ( ••• حمەسور وەکو گوتمان ڕەشە مسکێن بوە ، تێـکەڵاوکردنیشی‌و چونەناوکاروباری ئەوێ‌و ئەوەش ، ئەبێ پشت‌بەزەمینەیەکی کۆمەڵایەتی پتەوبەستێت کە ( حمەسور ) بـە پـێی داب‌و نەریتی کۆمەڵ نەیبوە •• هتد ) ـ تـەواو ) دیارە ئـەو زەمینـــە کۆمەڵایەتیەی کـە ئەو نەیبـوە ، بەپـێی داب‌و دەسـتوری کۆمەڵـگە بۆپێشەوایەتی ئەم ئیشە ، یەعنی ( ارشاد ) ، دەگەڕێتەوە بۆ بنەچەی ، کە دەبێت : بە ڕەسەن بچێتەوە سەر یەکێك لەنەوەکانی ( امامی علی ) ئـەم ئیسپاتی وەراسەت‌و بڕوانامەیەی هەبێت ! ئەوسا بۆ ئەم ئیشە ( ارشاد ) دەشێ‌و لەسەری دەخوات •••! ـ ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێـکۆشان‌و زۆرانبازیە کە زۆر لەمێژە پەیدا بوبو ، لەسەرحوکومڕانی کردن لەنـاو کۆمەڵـگەی موسوڵمانەکاندا ، کە ناکۆکیەکەی ( امامی علی )و ( معاویەی کوڕی ابی سفیان ) پۆپەی ئەو تێـکۆشان‌و زۆرانبازیەبو ••! ـ ئەگینـــە دەبێت ( ئەوکەسە ) لەڕێی عیبادەت‌و بەجێ‌گەیاندنی مەراسیم‌و پەیڕەوی

ئاینیو پەرستنەوە ( پێبگات )و سەلاویشی بداتەوە ئنجا دەبێت بە (شێخ)..! کە بەم جۆرە شێخانە لە ولاتی ئێمەدا پێیان دەوترێت ( شێخیبەرماڵ )! وا دیارە ( حمەسور )یش پەلەی بوە ، ویستویەتی بەسەر قۆناغەکاندا باز بدات ، بۆیە نە پەرژاوەتە سەر ئەم خەباتو تێکۆشانە !! بۆ گەیشتن بە ئاواتو ئامانجەکەی ، وە هەر بۆیە لەم ڕێبازەدا نامراد بوە ... هتد هەرچەندە لە کاروباری ( ارشاد )دا ، لەڕووی کۆمەلایەتیو متمانەو باوەڕەوە بۆ ئیشی ( ارشاد ) ، شێخی بەرماڵ تامی ئەو شێخانە نادەن کەوا ئەو ( ئیسپاتی وەراسەتو بڕوانامەیان ) هەیە کە وا باسمان کرد ..، بازاڕی ( ارشاد )و نازو ئیعجازیان لای خەلکی وەکو هی ئەوانیتر گەرمو گوڕ نییەو ناویێن ...! تەنانەت کابرایەکی ( سنەیی ) ساویلکەی دەلبەندی ( سەیدوسادات ) ، باوەڕومتمانەی ، بە کورتی « خۆشەویستیەکەی » بەرامبەر بەم بەرەیە ـ واتە بەرەی سەید ـ دەگاتە ڕادەیەك ، فەزلو چاکەی ( گوێدرێژە ) کانیشیان دەدات هەمو گوێ دایژێك کەدەلێت : ودەیان کات بە گەورەو سەرداری تێکڕا هەمو گوێ درێژێك کەدەلێت : ( کەرگەل سەی گەل .. سەی گەل کەرگەل ) !! لێرەدا ( گەل ) ئەداتی جەمعە . ر

لە لاپەڕە (٣٣)ی کتێبەکەی مامۆستا ( مصطفی عسکری ) ـ ئاوڕدانەوەیەك بزوتنەوەی هەقە ، بە زمانی مامۆستا ( محمدی مککریم )و مامۆستا ( حمزة عبدالله )وە هاتوەکەگوایا : [ حمەسور بەپێی ئەوەی کەپێشتر وترا لەبنەماڵەی شێخان نییەو لەڕیشەی کۆمەلایەتیەوە ئەچێتەوە سەرجوتیارانی ڕەنجکێش ، لەوانەیە بەکردەوە باسکراوەکانیان وای هەلسەنگێنین کە نوێنەری هێلێکی ڕادیکالی مەشرەبە لەبزوتنەوەی هەقەدا لەگەل دەمارێکی باش لە واقیعو دەورو پشت نەگەیشتن ، کەفو

گوڵ دامرکاندنەوەی زووبەزوویشی ئەم ڕایەمان زیاتر ئەچەسپێنێت ..! مامۆستا ( حمزە عبدالله )یش لایەنی ئەم ڕایە ئەگرێت بەرەی حمەسور بەبەرەیەکی « چەپڕەو » ئەداتە قەڵەم ... هتد ] ـ تەواو ـ

ئەم چەند دێڕە ، کەبەم جۆرە تۆمار کراوە ، ناوئاخنی بیروڕاکانی پێویست بە ڕوونکردنەوەو لێدوانێك دەکات :

بێگومان هەمو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەپێی بنچینەی ئایدیۆلۆجیاکەی خۆی ( چەپڕەوو ڕاستڕەوو ، ڕادیکالیو کلاسیکیو ڕۆمانتیکی .. هتد ) تایبەتی خۆیی هەیە ، بەڵام تەقەلادان بۆ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بزوتنەوەیەك بەکێشو تەرازووی بیرو باوەری بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیتر ، کە لە بنچینەی ئایدیۆلۆجیەتیاندا لەیەکەوە دووربن ئەمە هەوڵێکی بێسودو بەهەڵەدا چونە ..! خۆ ( هەقە )کان لەسەربناغەی ئایدیۆ لۆجیای تەسەوفەکەیان مابونەوە ..، بڕیاریان نەدابو جاف واتەنی ( گاڵیان وەگوێزن ) بولایەکیتر ..! دیسانەوە هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنو لێكدانەوەی کارەساتێك کەچەند چەرخێك لەمەوپێش ڕوویداوە ، بەپێی بایەخو بیروباوەڕەکانی ئەمڕۆ ، گەرچی لە هەندێ وردەبابەتی گشتیەکەیاندا لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەکارەساتی ئەم سەردەمەش بچێت ، بێچەندوچون ، ئەم هەوڵو تەقەلایەش مەبەس نادات بەدەستەوەو سەر دەکات ، وەیا بە لای کەمەوە ، غەدر لەکارەساتەکە دەکرێت ..! هەروەکو : بێین سەرزەنشتی ئەو کوروکاڵ هەرزەکارانە بکەین کە جاران کورتەكو شەرواڵی پزو خامەکیان لەبەر دەکرد .. بڵێین بۆچی پانتۆڵی ( کاوبۆی ، وەیا فلاتیان ) لەبەر نەکردوە ..!؟ هەروەها هەوڵدانو کۆشش بۆ جێبەجێو چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵیەتیو کارەساتەکانی ئەم سەردەمە ، بەپێی بیرو باوەڕو کێشو

تەرازووی دێربن هەمان دەستور ئەمیش هەوڵێکی بێسودە ، مەبەس‌و ( هدف ) ناهەنگێوێت •• بەڵکو کورت دێنێت ••! هەروەکو یەکێك بۆ بڕینی ڕێگایەکی دوورو درێژ ( ولاغ ) بەباشتر بزانێت لە ( ئۆتۆمۆبیل ) ئیتر ڕاستترین زاراوەو ، وشە بۆ ئەم جۆرە ڕەوشت‌و هەڵوێستەش ( کۆنەپەرستێتی ) پڕ بەپێستێتی ••

دیسانەوە لەڕووی چینایەتیەوە ئاشکرایە ، لەژیان‌و گوزەرانی ڕۆژانەشدا دەی‌بینین هەرکەسێ لەبنەچەدا بچێتەوە سەرجوتیارانی ڕەنجکێش ، مەرج نی‌یە کەبێتە نوئەری هێڵێکی ڕادیکالی ، ئەمە چ‌لەبزوتنەوەی ( هەقە )دا ، وەیا لەهەر بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتی فراوانتردا بێت ••، دیسانەوە مەرج‌نی‌یە هەرکەسێك کە نوێنەری هێڵێکی ڕادیکالی یا نوێنەری هەر هێڵێکی‌تر بێت ، دەبێ هەر بچێتەوە سەرجوتیارانی ڕەنجکێش ، وەیا چینێکی تایبەتی ، وەیا ببێتە نوێنەری ئەو بنچینە کۆمەلایەتیەی کە خۆیی لێوە هاتوە ••! هەمیشە ، لەهەمو کاتێکداو لەهەمو جێگەیەکدا دروست نی‌یە کەوا نوێنەرایەتی هێڵێك‌و چینێکی تایبەتی سەرومڕ بەستریت ، بەبەرەیەکی تایبەتیەوە ••! چونکە لەژیان‌و گوزەرانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەدا ، گەلێك ڕووداو ( الاحداث ) دەبینین کە بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونەوەیە •••، زۆر کەس هەیە لەبنەچەیەکی ڕەنجکێشە کەچی بەدیمەن‌و دیکۆرو بیرکردنەوەیدا هەرگیز بەلای بنەچەکەی خۆیدا ناچێت لافێکی‌تر لێ دەدات •• دەتوانین بڵێین نوێنەری لایەکی‌ترە ، لەناو بنەچەکەی‌خۆیدا •• بەلام بۆچی ئەم جیاوازیەو لەڕیزدەرچونە لەناو کەسانی بەرە جۆربەجۆرەکاندا هەیە ••؟! ئەمە دەگەرێتەوە بۆ ئەوکەسانە خۆیان‌و ئەو کێشانەی ڕۆژانە دەی‌هێنێتە بەردەمیان ، ئەوسا جێ‌بەجێ‌و حەل کردنی کێشەکانی ڕۆژانەی خۆیان لەبەرەکەی‌تردا دەبینن ، ئیتر تا زۆرتر بەتەنگ خۆیانەوەبن ،

غەمی خۆیان بخۆن ، بەپەر ش تەنگ‌و چەڵەمەکانی خۆیانــەوە بــن‌و بەس ••! زیاتر بازبازۆکێ‌و ئەمبەروئەوبەر دەکەن ! ئنجا « دامردنەوەی زووی کەف‌وکوڵ »یشــ وچــان‌و پشوویەکــە بــۆ ( گێرِگۆرِیــن ) ، پێشەکیەکی سروشتی‌یە بۆ گورِخواردنەوە بۆ قەڵەمبازو گوژمێکی‌تر ••!! خۆ لە فیزیادا هەیە : ئەو مادانەی کە زوو گــەرم دەبن زوویشــ ســارد دەبنەوە ••! بابە زاراوەی فیزیا بی‌ڵێین : گەرمیەکە دەدەنەوە ••! چونکە ساردبونەوە بارێــکی وزەیە ( الطاقة )لــە مادەکــەدا •• هەروەهــا ئەوانەی هەچ بیروباوەرِێــك‌و رِێبازێــکی کۆمەڵایەتــی بەئاســانی‌و زوو بگرنەبەر ، هەمان دەستور بەئاسانی‌و زوویش دەی گۆرِن‌و دەی‌دەن بــە دەستەوە ••! چونکە ئەگەر گــەرمی ( الحــرارة ) وزەیــەك بێت بــۆ بزوتنەوەی مادەو گۆرِانــی لەبارێــکەوە بــۆ بارێــکی‌تر ، هەروەهــا بیروبــاوەرِی کۆمەڵایەتیشــ وزەیەکــە ،وەزەیەکــی کۆمەڵایەتیــە ( Emergy - Social ) بۆ رِەوشت‌و رِێبازگرتن‌و کردەوەی کۆمەڵاتی، بۆ بازبازۆکی‌و ئەمبەروئەوبەرکردنیش لەناو کۆمەڵــگەدا ••!

خۆ ئەگە بە وردی سەیرێــکی ئەنجامی کردەوەکانی ( حمەسور ) بکەین دەردەکەوێت وەکو مامۆستا ( محمــدی مــلا کریم ) لەکتێبەکــەی مامۆستا ( مصطفی عسکری )دا وتویەتی : ( ئەو دەمارە باشەی کەلەواقیع‌و دەورو بەر نەگەیشتندا ) حمەسور هەیبوە ، دەڵێم نــەك هــەر سەری‌لــە (هەقە)کان شێواندبو ، وە بوبوبە ( پواز ) ••! وەیا کەرتێــکی سەربەخۆ لەناو بزوتنەوەی ( هەقە )دا بەڵــکو بوبوە ( لەکە )یــەك بۆیــان لەنــاو کۆمەڵــگە فراوانەکەدا ، چونکە نانێــکی لەگەڵ ( هەقە )کاندا خواردوبو ، کردەوەکانی ئەم لەسەر ( ئەوان ) حیساب دەکراو بەسەر ئەواندا ســاغ دەبوەوەو دەسەپا ••! خــۆ ئەگــەر لەقۆناغێــکی تایبەتــی بزوتنــەوەی نیشتمانیدا ( حمەسور ) دۆست‌بوبێت ، ئەمە لەرِووی کۆمەڵایەتیەوە شتێکی

سەیرنی‌یە ...! تەنانەت گەلێك لەدەرەبەگەكان ، لەگۆشەی كۆمەلایەتی‌و ناوبانگ‌و درەوشانەوەی خۆیانەوە لەناو كۆمەلگەدا ، لەقۆناغێكی تایبەتی‌دا دۆستبون لەگەل بەرەیەكی نیشتمانی ، وەیا لەگەل چەند كەسانێكی بەرەیەكی تایبەتی نیشتمانیدا ، پەنایان داون ، پاراستویانن ، كە ئەم مایەی شانازیە بۆ ئەوان پێش پەناهێندەكان ..! تەنانەت تیایاندا هەبوە ، چارەنوس‌و ئاوات‌و هیوای خۆیی بەستۆتەوە ، بەو بەرەنیشتمانیەوە ، كە خۆی بەدلی بوەو پەیوەندایەتی لەگەلیدا هەبسوە ، چالاكی‌و ئازایەتی لەناویاندا ئاشكراو جێ دەستی دیاربوە ..!

بەم بۆنەیەوە ڕووداوێك دەگێڕمەوە - گەرچی گاڵتەو گەپ ئامێزیشە - بەلام لایەنی دراماتیكیەكەی لەڕووی كۆمەلایەتیەوە ، مانایەكی تایبەتی هەیەو قوژبنێكی گرنگی هاندەر ( الحافز ) ڕوون دەكاتەوە ، بۆیە بەنمونە دەی‌هێنمەوە تا خوێنەری بەڕێز لەڕچەو ڕێبازی مەسەلە كۆمەلاتیەكان نزیك بێتەوەو یارمەتی بدات لەتێگەیشتنیدا .

دەلێن : - ئۆباڵی بە ئەستۆی ئەوەی وتی - لەسالانی جەنگی دوومی جیهانیدا گیرفان بڕین بەجۆرێكی سامناك لەشاری ( القاهرة )دا تەشەنەی كردبو .. لێپرسراوانی ئاسایش‌و پۆلیس ،بۆ دانانی سنورێك‌و بنەبڕكردنی ئەم تاوانە ، كەوتنە خۆیان ، بازووی هیمەتیان لێ هەلمالی .. هتد ، ئنجا هاتن لێهاتوترین بەڕێوەبەری ( مدیر )پۆلیسیان دەست نیشان‌كرد بۆ هەستان بەئەركی دۆزینەوەی شێوازی گیرفان‌بڕینەكەو ، بنكەو ڕێكخراوەكانی گیرفان بڕەكان ... هتد هەروەها بەجۆرێكی هونەری ( فنی ) هاتن میكیاجی بەڕێوەبەری دەست‌نیشان‌كراویان كرد ، هەیئەت‌و قیاوتیان گۆڕی‌و خستیانە شێوەی سوالكەرێكەوەو فەرمانیان دایە كە هەفتەی دووجار بە بێ‌دەنگ بەپۆستەدا ڕاپۆرتیان بۆ بنێرێت ..!

بۆ ئەم ئیشە پشووی دوو مانگیان دایە بەموچەوبەراتی ( الراتب والمخصصات ) تەواوەوە ، تا دوو سێ هەفتە پەیتا پەیتا ڕاپۆرتی دەنارد ، لەپڕ ڕاپۆرت ناردن کۆتایی هات ..! بەڵام پاش ماوەیەك نامەیەکیان لەلایەن بەڕێوەبەری نێرراوو فرستادەکەیانەوە بۆ هات کە تیایدا دەڵێت :ـ [ ئەم نامەیەم بە وازهێنان ( الاستقالة ) دابنێن لەفەرمانبەرایەتیەکەم ، چونکە ئەم فرمانەی ئیستام بۆمن قازانجترە ..! ] هەرچۆنێك بێت ئەم پیاوەتی کردوە ، کە وا خۆی بەسەر لایەکدا ساغ کردۆتەوەو کوردواتەنی : نەبوە بە کەری ناو جۆگا : قەپاڵێك لەملاو ، قەپاڵێك لەولا ! وەیا نەبوە بەهاوڕێی کاروانو هاوکاری جەردە ..!

بابێینەوە سەرەوکاری باسەکەمان ، ئیتر وەکو دەڵێن ئەگەر : ( نیشتمان هیءهە موان بێت ) .. هەمو کەسێك بۆی هەیە دەم لەنیشتمانپەروەریەوە بدات ، ئنجا بۆ ئەوەی ڕێ بۆ ( سپڵە )ی خۆش نەکەین ، با ئێمەیش هەروەکو ئەو دوو مامۆستایە ( محمدی ملا کریمو حمزة عبدالله ) دەڵێن : لاپەرە (٣٣) کتێبەکەی مامۆستا (مصطفی عسکری) هەروای ( هەڵسەنگێنین کەوا حمەسور نوێنەری هێڵێکی ڕادیکالی مەشرەبە لە بزوتنەوەی هەقە )دا ... هتد سەرەڕای ئەمەش ( سەلاو )ی بۆبدەینەوە بڵێین لەگەڵ بزوتنەوەی نیشتمانیدا دۆست بوە .. گەرچی لەکاروبارو مەسەلەی کۆمەلایەتیو نیشتمانیدا ، بڕیار لەسەر کۆتایی ، کوردواتەنی ( کەوش لەبێ کردن ) و ئدوا ئەنجام بدرێت باشترە ئەو ئەنجامەی کەچرای ژیان تیایدا دەکوژێنەوە ، ئەوسا بڕیارەکە ، جۆرە ئازادیو سەربەستیەکی تێدایە !! وەکابرای باسکراویش لەسنوری وزەی کومەلایەنی Emergy - Social چۆتە دەرەوە ، وەکو پێشتر باسکرا ... ئنجا ئەگەر ( حمەسور ) لەگەڵ بزوتنەوەی نیشتمانیدا پەیوەندی باشو

دۆست بوبێت •• بەڵام بۆ ( هەقە )کان بەکێشتی ، وە بـۆ کۆمونەکـەی لەمەڕخۆی بەتایبەتی کۆست بوە ••! لەوە کۆستتر کە بەمنداڵ نەبون ، ویە وەجاخ کوێری ، لەسەر خۆو بەشێنەیی بڕیاری فەوتاندنی داون ••! خۆ ئەگەر ( حمەسور ) وەکو مامۆسـتایان( محمدی ملا کریـمو حمـزة عبدالله ) دەڵێن : ( چەپڕەوڕادیکالی ) بوبێت بەم بەرنامەیەی : « لەبـەر بورە منداڵ نەبون » ••! لەکۆمۆنەکـەیدا ، بەم کردەوەیەی قوڕی بـۆ چەپڕەوی‌و ڕادیکالی گرتۆتەوە ، هەردوکیانی زیندبەچـاڵ کـردوە ••! چونکە ) چەپڕەوی ، ڕادیکالی ، شۆڕشگێڕی ، دیموکراتـی •• تێـکڕا هەمو بایەخێـکی مرۆڤایەتی‌و کۆمەڵایەتی •• ) ئەم جۆرە وشەو زاراوانە ، هی ئادەمیزادەو بۆ ئادەمیزاد •••! ئیتر ئەگەر ئەم بەرەیە ( الفصيلة )یـە نەماو فەوتا ••، ئنجا وەکو کابرای کوردە دەبێت بڵێیـن : ( پاشـی باران کەپەنك ) ! ئەوسا نەوەستای کەپەنك‌و نەکەپەنك لەبەریش دەمێنێت ••!

ئەم بەرنامەیەی ئەم ئەگـەر مـەوداو ، سـنورو ، چوارچێـوەو ، شێوازی لێ دەرکەین شان لەبەرنامەی ( بۆمبانیۆترۆن )یەکەی لەمـەڕ ئەمەریکا دەدات کە خۆیی پێـوە هەڵدەکێشـێت‌و هەڕەشـە لەژیانـی ( گیانلەبەر ) ، چونکە تەنها کار لەشانەکانی ( الخلايا ) لەشی زیندەوەر دەکات‌و هەڵیان دەوەشێنێت‌و تەرتیبیان تێـك دەدات ، خـۆ ئەگـەر خوانەخواستە بەر هەرشارێك بکەوێت شاری خاپـورو بێسـاحێب دەمێنێتەوە •••، هەروەکو چیرۆك خوانەکـان لەچیـرۆك‌و بەسەرهاتـە دێرینەکاندا دەیان گێڕایەوە ، ودەیـانووت ( کەبـاب لەسـەر وەجـاخ دەسوتا •••، دوکان‌و بازار کرابوەوە ، بەڵام کەسی بەدیـارەوە نەبـو ، هەمو بوبون بەبت‌و مردبون ••! ) بەڵام ئەمڕۆ کانگای سامانی سروشتی‌و پیشەسازیەکانی سەروژێری خاکی ئەو وڵاتەی کە تووشـی ئـەم بەڵایـە

دەبێت ، هیچی لێنایەن ، دامەزراو ( المؤسسات )و کارخانــەو بانکەکان ساغو سەلیمن‌و دەرگایان لەسەرگازی پشتە ، بەڵام لەبت‌ومردوو زیاتر کەسی‌تری بەدیارەوە نابینرێـت ، بە ڕاسـتی پرۆگـرام‌و بەرنامەیەکـی جەهەنەمیە ..! مەگەر هەر بەبیری پیاوخراپ‌و دزو جەردەو ( ئەرسـین لۆبین )دا هاتبێت .. ( ئەرسین لۆبین )ی ڕاستەقینەی ئەم‌سەردەمە ..!

ئیتر مەسەلەکە هەر چۆنێـك بێت ، هـەردوو بەرنامەکـە ( بۆمبـای نیۆترونی‌و قەدەغە کردنی ، بونی منداڵ ) لەڕچەك بڕینەوەی ئادەمیزاددا یەك دەگرنەوە ، ئەو ئادەمیزادەی ، کە داهێنــەرو دروسـتکەری هەمـو پایەخێـکی‌مروڤایەتیە ..! ئنجا لەڕەوشتی ( چەپڕەوی )و ( ڕادیکالێتی ) حمەسوردا چرا هەڵـکەو چی تیاماوە ..!؟

ماموستا ( رشید محمد علی ) لەگوڤاری ( کاروان )ی ژمـارە (١٥) دادەڵێت : ( مەسەلەیەکی‌تری گرنگ ماوە، کەلای ( حمەسور )یەکـان هەیەو کاك مصطفی عسکری نەك هەر بەکورتی‌و تەنها جارێـکیش باسـی نەکردوە ، بەڵـکو هەر بەلایشیدا گوزەری نەکردوە ئەویش مەسەلـەی ( منداڵ نەبون )ە ، ئەم مەسەلەیــە لای ئەمـان هەیـە ، لای هیچ‌کـام لەبەشەکانی‌تری ( هەقە )و هیچ‌تاقم‌و کۆمەڵ‌و تایەفەیەك لە وڵاتی خۆماندا نەم‌بیستوە هەبێت ، ئەو کۆمەڵەی بەیەکەوە ئەژین هیچ منالیان نابێت ..) ـ تەواو ـ . ئەم مەسەلەیەی کەوا ماموستا ( رشید محمد علی ) باســی دەکات پێویستی بە ڕوون کردنەوەو شی‌کردنەوەیەکی تایبەتی هەیـە ، تا بگەینە پوختەی ئەوئەنجامەی کە ( حمەسور )یەکان تا چ ڕادەیەك فڕیان بەسەر ( هەقە )یەتیەوە هەیە ..؟! چونکـە ئـەم مەسـەلە سـامناکە ـ قەدەغە کردنی منداڵ بون ـ کەوا ئەم باسی کـردوە ، تەنهـا لای

( حمەسور )یەکان هەبوەو بەس ، لای ( هیچ کام ) لەبەشەکانی تری ( هەقە ) نەبوە ..

خۆ ئەگەر بەتەرازوویەکی وردی ئەلەکترۆنی ئەم کردەوەیە ( هەڵسەنگێنین ) کە لەناو ئەماندا هەبوە ، لەناو ( هەقە )کانی تردا نەبوە ، ئایا دەتوانین بڕیار بدەین کە ( حمەسور ) ( هەقە )بوە ..؟!سەرەڕای ئەوەش کە خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، لەکاتی خۆیدا بەشێتی یەکەی ( حمەسور ) وەیا بەسۆفیتی‌یەکەی ڕازی نەبوە ..! ( ئاوردانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە ــ مصطفی عسکری ) .. لەلایەکی تریشەوە مامۆستا ( رشید محمد علی ) لەڕچەو ڕێڕەوی نوسینەکەیدا بەبیری‌خۆی ( حمەسور )یەکان بەبەشێك لە ( هەقە ) دادەنێت ... هتد ! لەگەڵ تەواوی ڕێزمدا بۆ ئازادی بیرکردنەوە ...، بەڵگەنەویستە ( بدیهی ) ئەگەر دوو کەس ، لەسەر شتێك مشت‌ومڕیان بۆ ، بێگومان یەکێکیان لەسەر حەقەو ڕاست دەکات ئەوی‌تریان پەڵپو بیانو ، گەڕوگێچەڵو کردەوەیەکی وێرانکاریە ..! لەم بارەدا مامۆستا ( رشید محمد علی ) دەبوایە ، هەروەك ڕوشنبیرێك ، بۆ ڕاستی‌و حەقیقەت‌و حەقەکە بگەڕایە کە لای کامیانە ..! بەڵام هەرچۆنێك بێت نوسینەکەی شایانی سوپاسە ، ڕەنجەکەی بەفیرۆ نەچوە ، یارمەتی داوە لەڕوون‌کردنەوەی بەشێك لەحەقیقەتێکدا ..

بەڵام ئایا لەبەرچی مامۆستا ( مصطفی عسکری ) بەلای مەسەلەی منداڵ‌نەبون‌و قەدەغەکردنی منداڵبوندا نەچوە کەلای ( حمەسور )یەکان هەیە ..، ڕەنگە سەبارەت بەوە بێت کە مامۆستای ناوبراو خۆی لەشێخانی ( هەقە ) یەو ( حمەسور )ی نی‌یە ، وە ( حمەسور )یشی بەرەیە کەلە ( هەقە )کان جیا بۆتەوە هەرچۆنێك باسی بکردنایەو ، یان لەسەری

بنوسینایە لەوانە بو ، بایەخێـکی ئەوتۆی نەدەبو ، بەتایبەتـی ئەگـەر نوسینەکەی مەیلەو ڕەخنەو ڕەخنەکاری بوایـە ، بەرامبـەر بـە ( حمەسور )یەکان •• هەمیسان دوور نی‌یە لـەم ڕووەوە سڵی لـەوە کردبێتەوە ، کە بە بۆنەی ئەم ( حمەسور )ی منداڵ نەبونەیانەوە ، برینی کۆنی پڕۆپاغەندەی دژ بە ( هەقە )کان بەگشتی بۆچی بکولێنێتەوە ••!؟ هەرچۆنێك بێت ئەو خۆی وەلأم بداتەوە گەلێك باشترە ••

## ( ١٤ )

بۆ ئەوەی لەسەرجەمو تێکڕای ( عمومیات ) مەسەلەی ( حمەسور) تێبگەین ، واباشە لە وردەبابەتە تایبەتیەکانیەوە دەست پێبکەین ، لەوردەبابەتە دیاردیەکانیەوە • لەسەرووو هەمویانەوە ، لەهەمویان سامناکتر ( منداڵ نەبونەکەیانە ) کەوا مامۆستا ( رشید محمد علی ) باسی کردوە •

مامۆستای ناویراو لە وتارەکەیدا لەگوڤاری ( کاراون )ی ژمارە (١٥) ساڵی ١٩٨٣دا لە ( حمەسور )ی پرسیوە کە هۆی‌چیە منداڵیان نابێت ••!؟ ئەمیش وەڵامی دەداتەوەو ، دەڵێت : ( ئێمە خۆمان ناهێڵین منداڵمان ببێت بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کەلە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت : « واعلموا انما اموالكم واولادكم فتنة ، بەڵکو ماڵو دارایش دەگرێتەوە کە ( حمەسور ) ئەم ئایەتە پیرۆزەی کردوە بە نەزەریەو دروشم بۆ منداڵ نەبونەکەیان •• ئەوی لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاشکرایە ، ( فتنة ) وەیا ئاشوب هەر بە تەنها (منداڵ) ناگرێتەوە ، بەڵکو ماڵو داراییش دەگرێتەوە کە هەمان دەستور هەر لەچوارچێوەو سنوری ئەو ( فتنة )و ئاشوبەدایە ••! ئیتر ئەوی لەنوسینەکەی مامۆستا ( رشید محمد علی )دا زەقو ئاشکرا دیارە ، بەش بەحاڵی خۆم بەڕاستی دەزانم چونکە ( ڕەنجە بەکۆمەڵو

هەروەز بنچینەکەیەتی ) ، مامۆستا ( رشید ) دەڵێت : « حمەسور »یەکان ( دەرامەتێکی باشیان هەیە بەیەکەوە پەیدای دەکەن و دەیخۆن •• )ئیتر لەم حاڵەتەدا بەپێی بەهاتەکەی حمەسور بۆ منداڵ نەبون ، بەپێی ئایەتە پیرۆزەکە ، دەبوایە وازیان لەماڵ و داراییش بهێنایە چونکە لەڕووی ( فتنة )وە لەئایەتەپیرۆزەکەدا ئەمیان ، واتە ماڵ و دارایی پێشی ( اولاد = منداڵ )کەوتوە ، کەچی بەپێچەوانە هەڵوێستیان بەرامبەر بە ( مندالا ) ئەمان بایەخێکی تایبەکاریان داوە ماڵ و دارایی کەوا لەگەڵ منداڵدا بەجوت ( فتنة )و ئاشوبن !!

لەم دوو هەڵوێستە ناکۆکەدا بەرامبەر بە وەزع و بارێکی تایبەتی کەوا ماڵ و دارایی و منداڵ دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی ، ( حمەسور ) لایەنێکیانی لەلا باشەو پەسەندی دەکات و هەوڵی بۆ دەدات بەڵام لایەنەکەی تری کە ( منداڵە )کە بێچوی ئادەمیزادەکە مرۆڤە ، کە پەیدا کەرو دروستکەری هەمو بایەخێکی مادی و مەعنەوی ئادەمیزادیتی یە •• ، ئەمەیان بەچاك نازانێت و پەسند ناکات و قەدەغەی دەکات ••! مەسەلەکەی لا بوە بە ( کەمتیار ) کە دەڵێن گوایا : لایەکی دەخورێت و لاکەی تری نەء ••!!

نامەوێت زۆر لەسەر ( حمەسور )و بەرنامەکەی بڕۆم کەوا لەناو کۆمۆنەکەیدا بەئەنجامی گەیاندوە بەمە نەك هەرسڕەواندویەتە چارەنوسی ئادەمیزاد •• بەڵکو سڕەواندویەتە هەستی مرۆڤایەتی ئەو کەسانەش کەبەوپەڕی دڵسۆزیەوە بۆ ئەو ، لەناو کۆمۆنەکەیدا پێکەوە دەژین ، وە لەبەئەنجام گەیاندنی ئەم بەرنامە ڕەشەیدا ، بون بەکێڵگەی تاقیکەی ( حقل تجارب )ئەو ، کەوا بەزاوزێ نەکردن ، بە وەجاخ کوێری یەکی ئەنقەست تەمەنیان لەگەڵیدا بردۆتەسەر ! ئەمیش بەو جۆرە پاداشی

داونەوە ••، وە بەو شێوەیە بڕیاری فەوتاندنی داون کە داوێتی ••!!

لێرەدا چەند پرسیارێك خۆی فەرز دەکاتو دێتە پێشەوە : بۆچی ( حمەسور )بۆ بەرنامەو نەزەریەکەی لە ( فتنة )و ئاشـوبەوە دەست پێ دەکاتو لە ( زینة )وە جوانیەوە دەست پێ‌ناکات ••؟! ونایەت ئـەم ئایەتە پیرۆزە ( المال والبنون زينة الحياة الدنيا والباقيات الصالحات خير عند ربك ثوابا وخير املا •• ) ئایەتی (٤٦)سورەی ( الكهف ) ، بکـات بەنیەتو نەزەری‌یەی کاروباری خـۆی لـەم ڕووەوە ••؟! لەبەرچـی وەها بەو جۆرە بەڕەش‌بینی سـەیری منـداڵ وەیـا بێچـوی ئادەمیـزاد دەکات ••؟! وەلە منداڵ بەو جۆرە بەقینەدا چوە ، تەنانەت چاوی بەرایی نادات کەلەناو کۆمۆنەکەیدا بیان بینێت ••؟! وەکو مامۆسـتا ( ڕشـید ) دەڵێت ••

دوور نی‌یە ئەم هەڵوێستەی بەرامبەر بەمنداڵ ، کـەوا دیمەنێـکە بۆ چۆنێتی دەروونی ( سایکۆلۆجیەتـی ) ئـەو ، نەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو کوێرەوەری‌و مەینەتی‌و کەشمەکەشەی کەلەسەردەمی منداڵی دیویێتـی‌و تیایدا ژیاوە ، کە بەبینینی منداڵ برینی کۆنی دێتەوە سوێ‌و دەکولێتەوە ، وەیا کوڵۆڵیەکەی ئەو سەردەمەی خۆیی بیر دەکەوێتەوە ، وە کوپێشتر باسکرا ، وە هەر لەبەر ئەمەش بوە ، کەبایەخێـکی تایبەتی داوە بەباری ( دارایی‌و ئابوری ) خۆیان ، چونکە ئەمەیانی بە هۆی سەرەکی کوڵۆڵی وکەساسیەکەی سەردەمی منداڵیەکەی خۆی زانیوە، کە تەنها هەر لەمەدا ڕاست بوەو بەهەڵە نەچوە ••!

لـە لایـەکی تریشـەوە ، گـەرچی سەرپێ بڕیاردان ، بەبێ دەستـکەوتنی بەڵـگەیەکی بـە تینـی بایۆلۆجـی •• ، بەکورتـی بـەبێ لێـکۆڵینەوەیەکی علمـی - بایۆلۆجیـانەو

( فحصـــ ) ( Test ) لەبابەت نەبونی منداڵەوە ، بەبێ ئـەم پیشەکیـە بڕیاردان کارێـکی نابەجـێیە •• بـەڵام لـەڕووی کۆمەڵایەتیـەوە ( سوسیۆلۆجیا )وەو بەپێی پەیڕەوی ئیسلام و شیان‌و دروست بونی ژن هێنان تاچوار ••! ئەمە فەحس ( Test ) کردنێـکە بـۆ نێرینەکـــەو بەڵـگەیەکی بەهێز لەبارەی وەیانەبونی منداڵەوە پیشکەش دەکات •••• هتد خۆ بە ناشوکوری نڵێـــم لـەڕووی کۆمەڵایەتـی‌و پەیوەندایەتـی نێرومێوە ، لەکۆمەڵـگەی ئێمەدا بە ژن دەوێرین ••! دیـارە ئەمیشـ لەژنێك زیاتری هێناوە ••! ئیتر دەگونجێت بۆ شاردنەوەی ، کەم‌وکوڕی ئەم لایەنەی ژیانی ، هاتبێـت « منـداڵ نەبونـی » بەسـەر ناقمەکـەی‌و کۆمۆنەکەی لەمەڕ خۆیدا پەسندو فـەرز کردبێت ، ئەمـە هەروەکـو شێوازێـکیش بۆ لێهاتویی‌و ئیعجازو خواریقی ( شێختیە )کەی !! بۆیە دەبینین ، بۆ بەهانەی ئەم ڕەوشتەی پشتی بەو ئایەتە پیرۆزە بەستوە کە مامۆستا ( رشید محمد علی ) باسی کردوە • ئنجا کەم‌وکوڕی‌و ناتەواوی، لەملایەنەوە ، زیاتر پاڵی ناوە بە ( ڕەش‌بینی )یەکەیەوە بەرامبەر بەبونـی منداڵ ، زیاتر پشتیوانی ئەم هەڵویستەی بوەو پتەوی کردوەو خستویەتیە هەستێـکەوە ، وەیا هەستێـکی بێپەیداکردوە وەکو هەستی هۆنەرەکەی کەو تویەتی :

ئەگەر باغی من بێ سەمەر بێ سەمەر بێ

بە من چی باغی عالەم جوملە بەربێ ••؟!

کەوابو باهی ئەوانیش ، هی ئەندامانی کۆمۆنەکەشی ، وەکو هی خۆی بێ‌سەمەربێت ••!

هەر چۆنێك بێت ئەم کـردەوە ناهەمـوارانـە ( شـاذ ) لـەڕووی کۆمەڵایەتیەوە شتێـکی ئاسایی‌و ڕەمەکیە ، لەو وڵاتانەدا ، کەدووچاری

ئیستیعمارو فرستادەکانی دەبن ••، بە ناو لەژێر پەردەی کردو کۆشـی پیرۆزدا ( تابو ) لەگەڵێك شوێندا ڕوو دەدات بـە تایبەتـی ، لەناوچـە دوورەدەستەکانی ئەمەریکای لاتینیو ئەفەریقـاو ئاسـیادا •• هتـد لـەم ڕووەوە ، تەنانەت کوشتاری بە گەلەش قەوماوە ، وەکو لەم ساڵانـەی دوایەدا لەئەمەریکادا ڕوویدا : قەشەی ( ئەبرەشی ) یەك ، دێت شـەرابی مەرگ دەرخواردی نزیکەی (٩٠٠)کەسی سەربە ( ئەبرەشیە )کەی خۆی دەداتو هەمویان بەجارێك دەمرن •••! ئیتر بۆچی دەبێ ( حمەسور )و کردەوەکانی بدرێتە پاڵ ( هەقە ) لەکاتێـکدا ( هەقە )کان لەکردەوەکانی بەری بن •••!

دیسانەوە دوور نییە سـەبارەت بـە نەناسـراوی بـنو بنەچـەی (حمەسور)و ڕەنگو ڕوخسارو سفەتە تایبەتیەکانی وەکو : ( سوروسپیتیو شینیچاوی )بە بێچوەڕووس لەقەڵەم نەدرێت •• تا بەئاسانی بدرێتە پـاڵ ئەومیللەتەی کەیەکەمجار لەمێژووی تایبەتیەکانی وەکو : ( سوروسپێتیو لەولاتەکەیدا دامەزراندوە ، هەروەکو ( سورو سپێتیو چاوشینی )!! تەنها سفەتو پێناسی ئەو میللەتەیە کەڕژیمیسۆشیالیسـتی لـە ولاتەکەیـدا بنیات ناوە ••! خۆ میللەتانی ( ئەنگلۆسکسۆن )یش ، بەتایبەتی ئینگلیزەکان سورو سپیو چاوشینو لەپێش هـەمو میللەتێکی تری ئەوروپادا هاتونەتە ئەمولاتەو شارەزامانو پێمان فێربون ، وە بەسامانی سروشـتیمان تێـر بون ••! گەرچی تێرخواردنیان نییە ، ئەمە هەموی لەپێناوی ئەوەدایە ، کەوا بیروڕاکانی مستر ( سی • جی • ئەدموندز )و هاوکارانی بەرامبەر بە ( هەقە )کان بەتایبەتی ، وەیان بەبۆنـەی ( هەقـە )کانـەوە ، ئـەو بیروڕایانەی کە بڵاویان دەکردەوە بەرامبەر بە بـەرەی سۆشیالیســتی بەگشتی بەڕاست بگەڕێت ••! بە کورتی دەیانەوێت بڵێن : ( خەڵـکینە ئەمانەن نمونەی سۆشیالیستی ، ئەمەیان ئەگەر وابێت ، ئەوی تریان دەبێت

چی تری تێدا بێت ... هتد )؟! بۆیە کوردەواری خۆمان بە هەڵەدا نەچون کە وتویانە : ( سەگی سپی بۆ بارخانەی لۆکە زەرەرە ! یەعنی توکی سپی سەگەکە ، لە لۆکەکە دەچێت ، گەرچی لۆکەشی نی یە ، لەهەمان کاتیشدا لۆکەکە گلاو دەکات ..!

ئیتر ئەگەر ( حمەسور )و بەرنامەکەی بەواتەی (ناحەزو نەشارەزا)و سەبارەت بەوەی کە تەنها لەکردوکۆشیاندا ، لە ڕووی ئابوریەوە ، ڕەنجی بەگەلەو هەرەوەز دەوری تێدا دەبینێت ، وە لەدابەشکردنی بەروبوومیشدا یەکسانیو تەبایەکی تێدابوە .. ئەگەر هەر تەنها لەبەر ئەم لایەنە سۆشیالیست بوبن ... هتد کە لە ڕاستیدا سۆشیالیستی ڕژێمێکی ، هەروەکو سەرمایەداری کە چۆن هەموکەلو قوژبنێکی ژیانی ئابوریو کۆمەڵایەتیو فیکری ئادەمیزاد دەگرێتەوە ، ئەویش هەروەهایە ، دەبێت هەمو لایەنێکی ژیانی ئادەمیزاد سەرومڕ بگرێتەوە ، خۆ ئەگەر تەنها هەر لەبەر ئەو لایەنەی کەباسمان ( هەرەوەزکاریو یەکسانی ) سۆشیالیست بوبن .. بەڵام بەمنداڵ نەبونەکە ، سۆشیالیستیان وەجاخ کوێر کردوە ..، کەوابو بە حسابی سۆشیالیستێتی ئەمان ، دەبێت لەماوەی ئەم ( ٦٧ )ساڵەی تەمەنی سۆشیالیستی گەورەدا (یەکێتی سوڤێت ) ، ژمارەی نفوسو وزەی مرۆڤایەتیان ( Human - Emergy ) ، بهاتایە کزیو لاوازی ، لە پێنج وەیاشەش ملیۆن کەسیان زیاتر نەمابێت ، چونکە ئەوانیش زاوزێیان نەکردەو ئەوی ( مابێ )تیش ، پیرو کەفتەکارەو سەری لەگوێی قەبر دەلەرزێت ..! ئەوسا خۆشی لەکۆڕو کۆمەڵانی بەئیستیعمارو سەرمایەداری کەوا دژرەکەیان ، وەیا( هەوێ )کەیان هەر بەروونەمانو پوکانەوە دەچێت ..! ئایا ئەمە هیچ فرێکی بەسەر جیهانی واقیعو ڕاستیەوە هەیە ..؟!

شتێـکی‌تر ماوه لەم بارەیەوە ـ لەبـارەی منداڵ نەبونەوە ـ کـە دەبێت تۆزێك باسێـکی بکەیـن ، کارتێ‌کردن ( التأثیـر ) لەمێشـك‌و بیرکردنەوەی خەڵـکی‌و سنوردانان بۆ ڕەوشت‌و کردەوەو بیر گۆڕین • گەلێك لەچالاکیە کۆمەڵایەتیەکان کاری تێ‌دەکـات ، بـەرەو لایەکـی تایبەتی ، کە ئامانج‌و مەبەس بێت ڕای‌دەکێشمێت‌و ئاراستەی دەکات، وەکو: (پڕۆپاغەندەو ، بەگوێ دادان‌و دووپات‌کردنەوە ، جۆرەکانی هونـەرو شتی‌تری لەم بابەتە )بە مەبەسی ، چەسپاندن‌و ئیسپات کردنی فیکرەیەك ، یان دەرپەاندنی فیکرەیەکی‌ترو ، هێنانی یەکێـکی‌تر ، لەپێناوی گرتنی ڕێبازێك‌و هەڵوێستێـکدا ••! چونکـە ئادەمیـزاد هەر بریتـی نی‌یـە لەکۆمەڵێك کرداری بایۆلۆجی ڕووتی بەڵـکو بیرکردنەوەو فیکـرە ، وڕەوشت‌و کردەوەی کۆمەڵایەتی‌و کردارو ئیش‌و فرمانیشە ••

گریمان ( حمەسور )توانیویەتی بە هۆی پەبڕەوکردنی هەرەوەز لەفرمانداو یەکسانی‌و تەبایی لەئاموژگاری‌و پەروەروەکردنیانـدا ، باری ژیانی تاقمەکەی خۆیی چاك کردبێت‌و پاراسبێی لەنەبونـی‌و هـەژاری‌و ئاتاجی ، وە لەگەڵ هەندێ ڕەوشتی کۆمەڵایەتی تایبەتی خۆیدا چوبێتـە دڵی تاقمەکەی خۆیەوە ، بەجۆرێك شەیـداو دڵپەنـدی بوبـن‌و کـاری لەبیرکردنەوەیان کردوە کە منداڵیان نەبێـت باشـە ( منداڵیشـں زیـادە مەسرەفێکە •• ) ! بەڵام منداڵ بونەکە ، زاووزی کردن خۆی لە خۆیدا کردارێـکی بایۆلۆجیە کە لەبەیەك گەیشتنی ( نێرومێ ) لەنـاو هەمـو هەمو زیندەوەرێـکدا پێك دێت ، جگـە لەبەرەیەکی‌نـزم نـەبێت لەزیندەوەران ، کەوا ئەندامی نێرومێیان هـەر بەخۆیانەوەیـە وەکـو بەرەیەك ( کرم ) ••! هەربۆیەش پەیوەندایەتی نێوان نێرومی لەناوبەرەی ئادەمیزاددا ، پەیوەندایەتیەکی مرۆڤایەتیە ، دەبێت لەچوارچێوەی سنوری کۆمەڵایەتی ، کۆمەڵانی ئادەمیزاد بەدەر نەبێت ••! بەڵام لەبارەی منداڵ

نەبونەوە لەناو ئادەمیزاددا ، مەگەر یەکێکیان ، یان هەردووکیان ئەوا نێرومێیە لەڕووی فسیۆلۆجیەوە بەکەڵکی زاوزێ نەیەنو ناتەواوبن ، بەکورتی ( قسر )بن ••• هەروەها جێی باوەڕنیییە ، ئەم کۆمەڵەی « حمەسور » ، ئەم تاقمە تێکرا بەنێرومێیانەوە ناتەواو ، ونەزۆكبن •• تەنانەت ( حمەسور ) خۆیشی دانیبەوەدا ناوەو وتویەتی : ( خۆمان تاهێڵێن منداڵمان ببێت ••! ) وەکو مامۆستا ( رشید محمد علی ) دەڵێت •

ئاشکرایە بۆ منداڵ نەبون چەند ڕێبازێکی پزیشکیانە هەیە (طبی) کەپەیڕەو کردنیان ، دەبێتە مایەی منداڵ نەبون ، گەرچی ئەنجامەکانیان لەبەرگەلێك هۆ،بەنیسبەت نەبونی منداڵەوە لەصەداصەد مسۆگەرنییە ••، هەروەها گەلێك نیشانەی لابەلای نالەبارو ، مەیلەو نەخۆشیو ناساغی ، ئەوتۆیان دەبێت کە واز لێهێنانی دەبێتە دەرمانێکی سەرەکیو تاکە چارەسەر بۆ ڕزگار بون لەوباری ناساغیو نەخۆشیە[1] • سەرەڕای ئەمەش ئەو ڕێبازانە شارەزاییەکیان دەوێت ، کە بە پێی باری کۆمەڵایەتی تاقمەکەی ( حمەسور ) ئەم شارەزاییەیان نییە •••، تا ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا نەبیستراوە کەوا ( گژوگیا )یەکی سروشتی ناسراوی ئەوتۆ هەبێت بۆ ئەم مەبەسە بەکار هاتبێتو ئەنجامێکی تەواوی ، دابێت بەدەستەوە •• ئنجا دەگونجێت ئەمان ڕێبازو ، زانیاریەکی کیمیاییان بەکار هێنابێت ، بۆ تێكدانی ڕێڕەوی منداڵ بون ، کە ئەمەش هەمیسان لەڕکێفی ئەوانو توانای عیلمی ( حمەسور )دا نییە •• وەیا خوبرەوشارەزایی ( فارمۆکۆلۆجی )و دەرمانسازی کەسان وەیا ( لایەکی ) تریان ! فریا کەوتبێتو لەخزمەتو پیناویاندا بوبێت ، بۆیە ئەنجام گەیاندنو جێبەجێ

(١) لەم باسەدا زۆر سوپاسی پزیشك دکتور کاك دلێر نوری دەکەم •

کردنی ئەم مەبەستەیانو ، بۆئیسپات کردنی شێخێتیو ئیعجازی ( حمەسور ) •• وەکو ئیعجازی شێخەکەی ( یالانقۆز ) ••!

ئەوی شایانی باسەکاروباری کیمیاگەری هەر لەدێر زەمانەوە ، وەکو تێکنۆلۆجیایەك ••! بۆ چاوبەستی جەماوەری ساویلکەو لەخشتەبردنو بڕواکردن بە « توانای نەهێنی » بەکارهاتوە ••! ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کەوا ( خراپیەکە ) لەکیمیاو کیمیاگەریدایە ••، بەڵکو لەچۆنێتی بەکارهێنانی ئەم زانیاریەو ، ئەنجامەکانی دایە بۆبەرەی ئادەمیزادو کۆمەڵگەکەیسەرجەم •

ئیتر لەبەر ڕووناکی ئەم پێشەکیانە ، هەرچۆنێك بزوتنەوەی ( حمەسور ) هەڵسەنگێنین ، وەیا وەکو مامۆستای قوتابخانەکان دەڵێن « نمرەی » بۆ دانێین •• ناتوانین لەوە زیاتر بڵێین کە : ( حمەسور )و بزوتنەوەکەی لەناو ( هەقە )کاندا ، لەکەرتو پەرتو جیابونەیەکی وێرانکاری کە پێشتر بەتەمای بوەو سور بوە لەسەری ( مع سبق الاصرار ) ••! لەمە بەولاوە زیاتر هیچیتر نەبوە بۆ ( هەقە )و ( هەقەیەتی ) ••! ئنجاکێ ••، چلایەك لەپشت ئەم چالاکیەی ( حمەسور )وە بوە ••؟!

لەمەشدا باهەر بچینەوە سەرەوکاری ئەو نوسینانەی کەمۆستا ( مصطفی عسکری ) لەکتێبەکەیداو مامۆستا ( رشید محمد علی ) لەگوڤاری ( کاروان )ی ژمارە ( ١٥ ) ساڵی ١٩٨٣ بەناوو نیشانی ( مەسەلەیەکی مەزنو هەوڵێکی کەم ) •• بلاویان کردۆتەوە ، لەوانەیە لەتوێی نوسینەکانیاندا ، شتێکمان دەستکەوێتو ، وەلامێك بێت بۆ پرسیارەکانمان ، وەیا ڕووناکیەك بۆ ڕێبەدیکردنو گەیشتن بە وەلامەکە ••

ماموٚستا ( رشید محمد علی )دەڵێت : ( حمەسور ، خۆی دوای شیخ عبدالکریم بەخاوەن حەق‌ئەزانی لەڕابەرایەتی بزوتنەوەکەدا ، وە خۆی زۆر جارو تویەتی : « کەس‌و کاری شێخ » غەدریان لێ کردم من بێ‌کەس بوم ، ئەوان داگیریان کرد بۆ خۆیان ئەگینە دوای شێخ بۆمن دانرابو •• ) ـ « تەواو » ـ

ئایا چ‌حەقێك کە ئەم خۆی بەخاوەنی زانیوە ••؟! بۆچی لەکاروبارێکی کۆمەڵایەتیدا هەرچەندە باسی ئازادی‌و سەربەستی‌و دیموکراتیەتی تێدا بکرێت ، تەنانەت ئەم بایەخ‌و مانایانە کرابێت بەمافێك ، وەبۆ هەمو کەسێك بەیاسایەك مسۆگەر کرابێت ••، ئایا ئەم حەقە ، ئەم مافە نابێت بەپێی داب‌و دەستورێکی هەبێت وەیا هەل‌و مەرجێکی تێدابێت ••؟! بەتایبەتی لەکاروبارێکی وەکو ( ارشاد )دا ، کە ئەم مرخی لەسەرۆکایەتی‌و ڕابەرایەتیەکەی خۆش کردبو ••، لەکاتێکدا کە ئەم بەکێش‌و تەرازووی ئەو کۆمەڵگەیە ، وەکو ماموٚستا (محمدی ملا کریم) لە کتێبەکەی ماموٚستا ( مصطفی عسکری ) ـ ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی حەقەدا ـ دەڵێت : کە ئەو ، واتە ( حمەسور ) ، زەمینەیەکی پتەوی نەبوە ••! لەپێش هەموشتێکەوە ، ئەو ئیسپاتی وەراسەتەو ، بڕوانامەیەی کە پێشتر باسمان‌کرد •• بۆیە بەزەیی بەخۆیدا هاتۆتەوەو خۆی بەبێ‌کەس‌و ، قەلەندەر زانیوە لەناویاندا ••! ئنجا بۆگەیشتن بە ئامانجی خۆی ، لەناو ئەو کۆمەڵەدا ـ کۆمەڵەی حەقە ـ ڕێگەی ناهەموارو خواروخێچی گرتبوە بەرو کەڵکەڵەی کەرت‌کردن‌و جیابونەوەی ( الانشقاق ) کەوتبوە کەلەوەو بەم ڕێبازەدا ڕویشت ••• هتد ، ئیتر بۆ بەشەکەی خۆیشی ، بۆ تاقمەکەی لەمەڕ خۆی ، لە ڕچەڵەك بڕینەوەیان بە ( مندال نەبون ) لەمە بەو لاوە ، هیچی‌تری پێ نەبو تاکو ( حەقە )کانی تری پێ راکێشێت بۆ لای خۆی‌و ببێت بەزوربە( الاکثریة ) لەناویاندا ••!

بەم بۆنەیەوە ، فەرمودەیەکی بەنرخی ( شێخی سعدی )م ، بیر کەوتەوە کەبەڕاستی فەرمودەکانی لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە زۆر گرنگن ••، ئێستایش ، لەکۆڕی کۆمەڵایەتیدا تامو بۆیان هەر تازەیە !! لەگولستانە کەیدا ، فەرمویەتی :

کەس نیاید بزیر سایەی بوم
ور « هما » درجهان شود معدوم

واتە کەس نایەتە ژێر سێبەری کوندەبەبووەوە ، با لەجیهانیشدا ( هما ) کە باڵندەیەکی پیرۆزە نەمابێت ••، وا دەگەیەنێت ، ئەوەی بۆ ژیان کەڵکی نەبێتو شومو بەربێت ، کەس توخونی ناکەوێتو مەرقوزە ••!

ئیتر ئەو مافەی کە ( حمەسور ) خۆیبەمافندیکراو ( محروم ) دەزانێت لێی ، وە بەو جۆرە ، خۆیی پێوە ماندوو ، شەکەت کردبو ، ئەگەر بەهەڵبژاردنیش بوایە ، ـ هەرچەندە ئەم پێشەوایی‌و ڕابەرایەتیە لەناو ( هەقە ) کاندا بەهەڵبژاردنە ـ لەدەنگ دانیشدا لەوانە بو ( ئەم ) ئەو ڕاژەیەی ( نسبة ) نەبوایە کەبیگەیاندایە ئامانجەکەی خۆی چونکە مونافیسی لەم لەپێشتر هەبو ، کە وهەلومەرجی ئەم پێشەوایەتی‌و ڕابەرایەتیەی تێدا بێت ! ( حمەسور ) خۆی پێ ناگیرێت‌و دەیدرکێنێت و دەڵێت : ( ئەگینە دوای شێخ بۆ من دانرابو ) ••! سەرچاوە پێشو ( کاروان ) ١٥ساڵی ١٩٨٣ •

لەم ڕستەسکالاّئامێزەدا کە لە دەمی ( حمەسور )ەوە ، وەرگیراوە ، بۆمان هەیە کە بڵێین : کێ ••؟ چ لایەك ••؟ دەستی داوە بەپشتیدا بۆ ئەم ڕابەرایەتی‌و پێشەوایەتیە هانی داوەو پێشەکی ئەم کۆڵەباڵەی لەبەر کردوە ••!؟ ئەمە ئەگەر پیلانێك نەبوبێت ••! هەڵبەتە شێخانی سەربە

( هەقە ) دەیانزانیو لەشەدەڵە دەریان نەدەکرد ...، بەڵکو دەهاتن ، بە دەستی خۆیان ( جبەو مێزەرەکەی شێخیان ) لەسەر دەنا ... هتــد گریمان ئەم شێخانەش ئاگادارنەبوبن ، بەلام خۆ دەبــو خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵە ، لەم ڕووەوە لای یەکێك شتێــکی هــەر بدرکاندایە ، کە گوایا ( حمەسور )ی بەدڵە...و بۆجێگەکــەی خــۆی دەشێو لێی دێت ..! بەلام هیچ شوێنەوارێــکی دیاردیو ئاشکرا ، بۆ ئەم کەینوبەینە نی‌یە ...، لەقسەی ( حمەسور )خۆی بەولاوە ..!

لە ڕێبازی کردوکۆشی ( حمەسور )دا ، وا دەردەکەوێت ، کــە لەناو بزوتنەوەی ( هەقە )دا لەقەبارەی خۆیی زیاتر ، وەجۆرە نازێــکی درابێتێ بۆ ئەوەی ئەم ( کەتنە )ی ! پێ‌بکەن ـ کەتنیو شەقو پەق‌کردنی بزوتنەوەی ( هەقە ) ، وەیا بی‌خەنە وەزعو بارێکەوە : ئەگەر (هەقە)یەتی دۆستی وای هەبێت ئیتر دوژمنی بۆ چی‌یە ..!؟ ئنجا هاتون کردوویانــە بەنێچیرێــکی پەل‌وپۆشکاوی ( ستایش‌و هەڵدان !! ) ، دوور نی‌یە لــەم ڕێبازەدا مەرگی خوالێخۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی بەئاوات نەخواسبێ‌و بەسەعــاتو دەقیقە نەژماردبێت‌و لەمردنی بەپەلە نەبوبێت ..! ئەم هەر ئەو مریدە نەبوە ، لەبارەی چانەخواردنەوەوە ، لە مەجلیســی ســۆفی‌و شێخەکاندا بەسەر شێخەکەیدا ( ئوستادە )کەیدا خۆی دادەشرنیگێنێت ! هەر ئەو مریدە نەبوە کە خوالێخۆشبو ( شێخ عبدالکریم ) زوودەســت نیشانی‌کردوە ، و بەشێتی‌یەکەی ، بەسۆفێتی‌یەکەی ڕازی نەبــوە ..!؟ لێرەدا پرسیارێك خۆی فەرز دەکات‌و دێتە پێشەوە .. ئایا ئەم دەمارەی ( حمەسور ) لەکوێ‌وە ، لەچ لایەکەوە گیراوە ، وکێ هەڵی داوە ...، وە بۆ ئەم ڕابەرایەتی‌و پێشەوایەتیە ، بەڵێن‌و گرەنتی داوەتێ ..!؟

مامۆستا (حمزة عبدالله) لەکتێبی ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە ـ

دانەری مامۆستا (مصطفی عسکری) لاپەڕە (٣١)دا دەڵێت :ــ [ حمەسور پاش مردنی شێخ عبدالكريم مێزەرەكەی لەسەر خۆی ئەنێ‌و جبەكــەی لەبەر ئەكاو ئیدعای شێخێتی ئەكات ، بەلاّم شێخەكان ملی بۆكەچ ناكەن ، لەشەدەڵە دەری ئەكەن ، ئەویش ئەچی بۆ ناو شوان ، پاشان ئەچێ بــۆ كركوك بۆ لای سەیدئەحمەدی خانەقا ، ئەویش هەروا ، نای گرێتە خۆی گوناهی ( بیدعەت داهێنانی ) ئەداتە پاڵو دەری ئەكا ، ئیتر ئەویش لەگەڵ دەستەو دایەرەكەی خۆی ئەچێتە «كلاّوقوت» ولەوێ سەقام گیر ئەبێ ••]
ــ تەواو ــ

ئەوی لەمانای ئەم‌و تەیەوە دیــارە : ــ ١ ــ حمەســور بەتــۆراوی بەنامرادی پشت دەكاتە شەدەڵەو بەجێ‌ی دەهێڵێت ••، ٢ ــ دەچێت بۆ ناو شوان ، لێرەش ئۆقرە ناگرێت •••، ٣ بە هەناسەی ــ ساردەوە دەچێــت بۆ كركوك ••، ٤ ــ وەكو ماڵە باوان ڕوو دەكاتە ماڵی ســەید ئەحمــەدی خانەقاو زوخاوی خۆی لای ئەوان هەڵدەڕێژێت •••!! بەلاّم هەڵوێســتی ئەمان بەرامبەر ( حمەسور ) ئەوەبــوە كــەوا دەریان كــردوەو گوناهــی ( بیدعەت ) داهێنانیان داوەتە پاڵ كوردەواری خۆمان‌و تویانە پرسیار عەیب نی‌یە ــ ئێمەش بینا لەســەر ئــەم پەنــدو حیكمەتــە چــەند پرسیارێــك دەكەین ••!

بۆچی ( حمەسور ) لەم بارەناسكەی كە تێ‌ی كەوتوەو شێخانــی سەربە ( هەقە ) لە شەدەڵە دەریان كردوە ، كەچی ڕوو دەكاتەوە كركوك‌و پەنا ( حەجە )كەو بیرە ( نەوتە )كان ••!؟ بەتایبەتی ماڵی سەیدئەحمەدی خانەقا •••، خۆ ئەمان بەخزمایەتیش بێت لەشێخانی ( هەقە )وە نزیكن ••! ئەمە دوای ئەوەی كە ( حمەسور ) لەناوچــەی « شــوان »یشــدا خــۆی تاقی‌دەكاتەوە •• ئەگەر ( حمەسور ) بیدعەت گۆنەبوایە ، ئەو ئیسپاتــی

وەراسەت و بڕوانامەیە ــ واتە ( شجرة الانساب )ی سەیدێتی کەبۆ (ارشاد) پێویستە ، هەیبوایە ، ئایا بیدعەت گۆیەکەی لێ نەدەبو بەنەخشی و .. بە لەم حاڵەتەیدا ئەو ماڵە دەستیان دەنا بە ڕوویەوە ، یان هەڵوێستێکی ( خەواریقی ) نەهێنی پیشەکە ( ارشاد ) بۆی لەقەڵەم نەدەدرا ..؟ ئایا باشتریان لەگەڵیدا دەبو ..!؟ بۆچی ( حمەسور ) لەم تەنگانەیەیدا ئەمانی بیر دەکەوێتەوە ، وسەریان پێوە دەنێ و بەسەریان دەکاتەوە ..!؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە هەرچۆنێك بێت ، کۆمەك کردن بەشەق و پەق کردنی کردنی بزوتنەوەی ( هەقە ) ، لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشانی مشور خۆران و ئاشنایانی گەلەکومپانیەکانی ( نەوت )و کردوکۆشی مستر ( سی . جی . ئەدموندز )دا ، بۆ سرەواندنە ( هەقە )کان و دەست لێ وەشاندنیان بە ( داخەوە یەك دەگرێتەوە ) ..! ئیتر با ( حمەسور ) بەچاوەشینەکانیدا بێچوە ئینگلیز نەبێت بێچوە ڕووس بێت .. با خەڵکی ئالان و سیوەیل ، وەیا دەوروبەری ماوەت بێت یانەبێت ..، ڕەنگ و ڕوخساری ئەم هیچ لەبابەتەکەو ڕەگ و ڕیشەی کۆمەڵایەتی بابەتەکە ناگۆڕێت ! بەڵێ خۆپاراستن و بەرگری لەخۆکردن کارێکی ڕەواو دروست و بەجێیە .. بەڵام لەڕێڕەوی ئەم زۆرانباریەدا ، بون بە پردو بەردەباز ، وەیا شێوازی خواروخێچ گرتن و بون بەدۆستی دوژمن ، بەکورتی ناپاك و دەغەڵ بە دۆست ناسین ... ( فەرمودەکەی خوالێخۆشبو ( شێخ عمری ضیاءالدین ــ ازیار به اغیار گرویدت چ قاعده ..! ) یادی مەردان بەرگی دووەم ــ دانەری مامۆستا ( ملا عبدالکریم مدرس )..، ئەمەیان لە ڕووی ڕەوشت و خووی کۆمەڵایەتیەوە ، ئیشێکی ناشیرین و نابەجێیەو هەرگیز نابێتە مایەی شانازی بۆ خاوەنەکەی !



دێی کەڵکەسماق
نیشتەجێی خوالێخۆشبو ( مامە ڕەزا )

# ( ١٥ )

له ساڵی ١٩٤٢دا خوا لێ خۆشبو ( شیخ عبدالکریم )ی شەدەڵــە کۆچی دوایی دەکات ، بەهەڵبژاردن ( مامەڕەزای ) برای جــێی ئــەو دەگرێتەوە •• تاکو بتوانین دەست نیشانێــکی ( تشخیص ) ڕاستو دروستی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) بکەین دەبێت ئەو بارۆ دۆخەمان لەبیر نەچــێ کە ئەم زاتە پێشەوایەتــیو ســەرکردایــەتی کۆمەڵــەی ( هەقــە )ی تێداکردوە ••، ئەمە سەرەڕای تواناو چالاکی تایبەتی خۆیشی ••، کــە تێــکڕا گورێــکیان دا بەو دابو دەســتورەی ، کە کۆمەڵــە ( هەقــە ) پەیڕەویان دەکرد ، ئەو دابو دەستورەی کە زووتر مستر ( سی • جی • ئەدموندز ) لەسەرەتای چاوپێکەوتنەکەی بــە خوالێخۆشــبو ( شــیخ عبدالکریم )دا بۆنــی کــردبو ! وە ( حیکمەتێــکی دنیایــی ) لەقســەکانی ( شێخ )دا بە دی دەکات ••! ــ کتێبی ( کــرد ، تــرکو عــرب ) لاپــەرە ( ١٨٧ ) ــ دانەری مستر ( ســی • جی • ئەدمونــدز ) ئــەو حیکمەتــە دنیاییانەی کە بۆ ( دنیای ئەوان ! )وەزنگی هەیە •• بۆیە بەڕاستو چەپدا تۆمەتو بوختانو پیلانیان بۆ سازدەکردن ، بە کورتی ئەو هەمو گفتــارە ناڕەوایانەی کە دوای ( هەقە )کان خرابو ، وە درابوە پاڵیان پەڵی (ئەوان)بو بە ناوشانیانەوە ••!

سالآنی پێشەوایەتی ( هەقە )کان لەلایەن ( مامەڕەزا )وە ، ڕێکەوتی ئەو سالانەی کردوە ، کە جیهان لەجەنگێکی خوێنیندابو دژی ( نازیتیو فاشستیتی ) ئەم جووتەڕژێمەی کە لەڕێڕەویاندا ، بڕەو بەبازاڕی زۆرەملیو ستەم دەدەن ••! لەم ڕووەوە لە سەرتاوەو لەپێشەوە دەستیان بەمیللەتو نەتەوەکەی خۆیان ڕادێنو دەبنە ملۆزمێکی چەتونو نەگریس بەسەریەوە ، تا تەواو کەنفتو کۆڵەوار دەبێت ، ئەوسا دەبنە دوژمنێکی سەرسەختی گەلانی تریش ••! ئیتر بەشکاندنو بەزینی ئەم دوو ملۆزمە ـ نازیتی وفاشیستیتی ـ وتەفروتوناو ، ئاوابونیان لەسەر شانۆی بەربەرەکانیو زۆرانبازی نێو دەوڵەتان ، وەکو هێزێکی دەوڵەتی سەر بەخۆ ، بەم ئاوابونەیان کۆمەلآنی خەڵك ئاهێکیان هاتەوەبەر ، گوڕو تەوژمێکیشی دا بە وشەی ئازادیو دیموکراتیەت لەهەمو جیهاندا ••• هتد ، گەرچی بوونی دیموکراتیەتو ئازادی بەفراوانی لەبەرژەوەندیو سودی ئەو ڕژێمانە نییە ، کە لە سەرچاوەوە ، لەسەر چەوساندنەوە بەندە ـ چەوساندنەوەی ئادەمیزاد لەلایەن ئادەمیزادی برایەوە ـ ئنجا لەکەفو کوڵی ئەم کارەساتانەی دوای جەنگەکەدا ، خوالێخۆشبو (مامەڕەزا ) پێشەوایەتی کۆمەڵەی ( هەقە )ی کردوە •

ئەم بارو دۆخە تازەیە ، کاریان لەکۆمەلآنی خەڵك کردبو •• تەنانەت ئەوانەی کە لە سرەی پێشەوەی هەندێ کۆڕو کۆمەڵدا بونو خۆیان بە پێشەوای بەرەوتاقمێك دەزانی ، بەپێی نەریتی ڕێبازە کلآسیکیەکۆنەکان ، لەناو کۆمەڵگەکەیاندا ، ئەمانیش دەمیان لە وشەی وەکو : ئازادیو دیموکراتیو سەربەستیەوە دەداو گرو گاڵیان پێوە دەکرد ••، وەیا نانو پیازیان پێوە دەخوارد •••! ئیتر خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )یش هەروەکو خەڵکیو کەسانی سەردەمی خۆی ، ئەو شەپۆلە ، ئەو تەوژمە بەبارێکی باشدا بردی •

لەسەرەتاوە وتم : لەبەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا باوکم مامۆستای قوتابخانەی سەرگەڵو بو ، وەهەندێ لەکوڕە شێخانی سەربە ! (هەقە)ش لەوێ قوتابی بون وەکو خوالێخۆشبو ( شێخ مصطفی‌ی کوڕی مامەڕەزا ) ..، بەم بۆنەیەوە ، وا دەردەکەوت کە دۆستایەتیەك لە نێوان ( مامەڕەزا )و باوکمدا هەبوبێت ..، لەکاتێکدا کە ( مامەڕەزا ) دور خرابوەوە بۆ هەڵەبجە ، گەلێك جار بۆدیدەنیو پێڵاو بەدروستکردن دەهاتە دوکانی ( عبدالله زهدی ) برام ..، دوای هەواڵپرسین دەیفەرمو ئێوە برازامن .. کە ئەمە نیشانەیەکی بەوەفاییە ، بە ڕاستی منیش بەش بەحاڵی خۆم پڕ بەدڵ تاسەی بینینو بەخزمەتگەیشتنیم دەکرد .

زۆرجار لەبابەت ( هەقە )وە گفتوگۆمان دەکرد ..، با لە توێی ( بێلایەنیدا ) ! ڕاستیو دروستیو نەشارمەوە ، چونکە حەقیقەتو ، واقیع هەرلایەنێکی هەیەو بەس ..! ئەویش لایەنەکەی خۆیەتی .. بۆ حەقیقەتو مێژوو هەندێ فەرمایشەکانی لەگەڵ ئەو وشانەدا کە خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) خۆی بەکاری دەهێنان لەناو دوو کەوانەدا کوتومت تۆمار دەکەمو دەنوسمەوە .

لەبارەی ڕێبازەکەیانەوە پرسیارم لێدەکرد ، خوالێ خۆشبوش بە زەردەخەنەیەکەوە وەکو موجامەلەیەکی بە نەزاکەتو بەسۆز ، تاکو چونە ناومەسەلەکەوە ، لای منیش ئاسان بێتو پێشەکیەکی هەبێت .. دەیفەرمو : ( تۆ نەسۆفیتو نە دەرویش ، بەڵام ئەوەندە بزانە پەکێك لە « سفەتە » گرنگەکانی « ئەهلی تەسەوق قەناعەتە » ..! ) وتم ڕاستەو گومانی تێدانی‌یە ، وایە ..، ئەو قەناعەتەی دەفەرمو کە خوالێخۆشبو ( شیخ ضیاءالدین )ی نەقشبەندی ، نەی‌ویستوە ڕاسواو شەرمەزاری کات ! وەکو لەپێشەوە باسکرا .. دیسانەوە فەرموی : [ ئێمە چۆن

دەتوانین ئەم « قەناعەتە » لەناو مریدەکانماندا پەرەی پێ بدەین ••، هەر تەنها بە « وەعظو نەسیحەت ، وارشاد »و ئاموژگاری‌و بەس ••، ئیتر سنورێك بۆ چاوچنوکی‌و ( تەماع )دا نەنێین ••! وەیا هیچ دەستێکی بۆنە هێنین ؟! کە لەم ( حاڵە )تەدا دەبینە یارمەتدەرێکی باشی چاوچنۆك‌و ( تەماعکاران ) چونکە لێیان بێ دەنگ دەبین •• وەیا بەتین‌ترین زەبرو زەنگدا بەرامبەریان ، « حەواڵە »ی خۆایان دەکەین ••، کە بەمە هیچ باکیان نی‌یە ، چونکە لە ( تەماعکاریان ) خواردوەو ( لەزەتیان لێ دیوە •• بەم پێیە ئێمەش دێین بە ناوی قەناعەتەوە ، دەبینە یارمەتدەری ( تەماع‌و تەماعکاری ) بە دەم کوت‌کردنی مریدەکانمان ، چونکە قورقەپیان پێ دەکەین کەناوی کەس نەهێنن ••!

دیسانەوە چۆن دەتوانین ( تەماعکاری ) بنەبڕ کەین ئەگەر دەست نەبەین بۆ ڕەگ‌و ڕیشە ئابوریەکەی ( اقتصاد ) ، کە « ملکیەتی فەردیە » واتە خاوەندایەتی تاکیە •• کەوا خۆراك‌و هاندەری یەکەمە بۆ ( تەماع‌و تەماعکاری )و ! نەبەین نەی‌گۆڕین‌و نەی‌کەین بە ( ملکیەتی‌گشتی ) ••! ئەگەر وانەکەین نە ( قەناعـەت ) لەناومانـدا گەشـە دەکـات وە نـە دەسەڵاتیشمان بەسەر ( تماع‌وتەماعکاریدا ) دەشکێت •! ] ـ تەواو ـ

بە ڕاستی لەم ڕوون‌کردنـەوە سادەیـەو پڕمانایـەی ئەو زاتـە ، لەگۆشەی ڕێبازەکەی خۆیەوە واتە لە ( گۆشەی تەسـەوفە )وە ، لـەم حیکمەتە دنیاییەی ئەم !! منیش سەرسام بوم • هەروەها فەرمـووی : ـ [ ئێمە ـ ( هەقە )کان ـ هیچی وامان پێ نی‌یە کەلە خەڵـکی بشارینەوە ، مەگەر ناحەز شتی ناڕەوامان بدەنە پاڵ ! ئیتر وەکو دەڵێن:مەنزڵ هەرپاك دەی‌بڕێت ••! ] لەپاشا وتم : ئایا دەزانن ئەم دەست درێژکردنە (ملکیەت)و خاوەندایەتی توشی گێرەوکیشمەیەکی فەلسەفیتان دەکات ، کـە لـە وزەی

ئێوەدا نی‌یە ..!؟ فەرمووی بەڵێ دەزانم ..، ئەم هەمو بوختان‌و درۆو دەلەسانە کە دوای ئێمە خراوە ، ئەو هەمو تەق‌و تۆقەی کەوا لەئێمە دەکرێت ..! لە ئەنجامی ئەم نیازو ڕێبازەمانەوەیە ، ئەمانە هەمووی بەشێکن لە هونەرو ،وێژەی ! ئەو گێرەو فەلسەفیە ...، بۆ زێدە ڕوون کردنەوە فەرمووی : بۆچی لەم ( دنیا یەماندا .. خاوەندایەتی لە ( خواوەندێتی ) جیا نەکرێتەوە ..! یەعنی خاوەندێتی لەلایەن ئادەمیزادەوە .. هتد ، کە لە ڕێڕەو ، ئەنجامی ئەم تێکەڵ کردنەدا هەرچی ناڕەوایی‌و خراپیەکی خاوەندایەتی هەیە ، لەم ( دنیا )یەماندا ..، لەناو کۆمەڵگەدا ئاوقای ( خواوەندێتی ) دەبێت‌و یەخەی ئەم دەگرێتەوە .. ئەی ئەمە بۆ باوەڕو بڕوا زەرەری نی‌یە ..!؟ منیش وتم گومانم نی‌یە وایە .. چونکە فەرمایشەکانی ئەوەندە ڕێك‌و بەجێ بو ، بواری نەسەلماندنی نەبو ..!

هەر بۆ نمونەو پاڵپشتی ئەم ڕاو بۆچون‌و فەرمایشەی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) دەڵێین : ئەگەر سەرزەنشتی ، کەسانێکی ـ بەڕواڵەت ئاین‌پەروەرکرا ـ لەسەر هەندێ کردەوە ، کە پەیوەندی بەژیان‌و گوزەرانی کۆمەلایەتیەوە هەیە .. کەوا ئەنجامەکەی بە دزی‌و گزی‌و ، درۆزنی‌و حوقەبازی بەکورتی بەخراپەو ئازاری ئادەمیزادو ( خەلقندەی خوا ) دەشکێتەوە ..! هاتو لەگەڵ ئەم کردەوە ناهەموارانەدا بەرەو کرانەوەو کەوتنە بەر پرسیاری : پەیڕەوی ئاینی‌و ئەم کردەوانە کوجا مەرحەبا ..؟ بێ گومان ئەگەر لەئاستی ڕاستی‌و حەقە ڕەقەکە ، دەمیان گۆ بکات‌و لاڵ نەبن ، کوتوپڕ دەڵێن : ( ئەمیان جیایەو ئەویان جیا ..، هەریەکەیان جێی خۆی دەگرێت ..! ) ئەمە وادەگەیەنێت کە ئەمانیش بۆبەرژەوەندی خودی خۆیان ، بۆ پاکانە لەپێناوی هەڵوێستێکدا ، کەکێشەیەکی وێژدانی تێدایە ، هاتون مەسەلەکەو کێشەکەیان جیا کردۆتەوە ..! ئەی ئەگەر بۆ بەرژەوەندی گشتی ، لە پێناوی ژیان‌و

گوزەرانی کۆمەڵگەو ئاسودەیی ویژدانی گشتیدا ..، مەسەلەکەو کێشەکانی جیاکرانەوە ! ئایا ئەمەیان هیچ بێباوەڕیو سەرپێچییەکی تێدایە ..؟!

لەڕێبازی وتو ، وێژدا لەخزمەت خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )دا وتم : خۆ ڕێبازەکانیتری ( تەسەوف )یش ، تەکیەو خانەقا بەدامەزراوێك دەزانن ( المؤسسة ) کەوابۆ مریدەکانیانو دەستو پێوەندیان ، هەمان دەوری یەکسانیو هاوبەشێتییەکەی لەمەڕ ئێوە دەبینێت .. هتد ، لێرەدا خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) خۆی پێنەگیراو دەستی کرد بە پێکەنین ، بەلاقرتیەکەوە فەرموی : ( ڕۆڵە : دەرەبەگەکانیش ، دیوەخانەکانیان بە دامەزراوێکی گشتی دەزانن ، کە هەمو کەسێك بۆی هەیە ڕووی تێ بکاتو پەنای بۆ بێنێت ..، بەڵام ئایا جێی هەمو کەسێکی تێدا دەبێتەوە .. وەیا هەمو کەسێك بۆی هەیە کەوا ئەرکو مەسرەفی خانەقاو تەکیەو دیوخان بپرسێتو بکۆڵێتەوە ..!؟ خۆ ئەگەر یەکێك پرکێشی بکاتو لەسەری بڕوات ، وەڵامەکەی لە : ڕزقێکەو خوا ناردویەتی ! بەولاوە زیاتر نییە ، ئەمە ئەگەر خاوەن پرسیار جێگەیەکی تایبەتی هەبێت لەلایان ..، ئەگینە وەڵامەکەی بە دڵ نابێت ! ئیتر پلەی دڵسۆزی بۆ دامەزراوە یەکسانیو هاوبەشێتییەکان بەندە بەئەندازەی ئازادی لە لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەیاندا ، وڕێگە دان لەم ڕووەوە بەو کەسانەی کە گوایا ئەم دامەزراوانە ، بەهی خۆیان دەزاننو گوایا بۆ ئەوانە ..! ئەگینە هەچ گفتوگۆیەك لەم بارەیەوە بێتە ئاراوە ، لە وتەیەکی ڕووت بەولاوە ، هیچیتر نییە ، وتەی ڕووتیش کەس تێر ناکات ..! )

ـ تەواو ـ

لەفەرمایشەکەیدا بەردەوام بو ، فەرموی : ـ لەناو ئێمەدا چ پیاو چ

ئافرەت بۆی هەیە لەهەموشتێکی گەورەو بچوك بپرسێتەوە ، هەمو مریدەکانمان دەتوانن ، بەوپەڕی ئازادیەوە ، لەهەمو شتێك بدوێن و ، ڕەخنە بگرن ، بالێ دوانەکەشیان پەیوەندی بە شەخسی ( شێخە )وە هەبێت و ئەم بگرێتەوە •• هەمو کەسێکمان بەش بەحاڵی خۆمان بۆمان هەیە پەنجە بکات بەچاوی کەمتەرخەم ، وەیا ئەو کەوا لە ڕەوشت لادەدات و درێغی دەکات ••! لەناو ئێمەدا کەس بۆی نی یە سەبارەت بەوەی کە دوو ڕکاعەت نوێژی سوننەت زیاتر دەکات ! ئیتر خۆی بەفریشتە بزانێت و خۆی بەسەر براکانی و ئەوانی تردا ( با ) بدات و لەخۆی بگۆڕێت ••! ئێمە چون یەك بایەخ بەمریدەکانمان دەدەین ، بەیەك چاو سەیریان دەکەین ، جەماوەرەکەمان دەکەین بەچاودێر ( رقیب )بەسەر خۆمانەوە ••! لەتەنگانەشدا هەر پشت بەوان دەبەستین و ئەوان دێنە مەیدانەوەو هەر ئەوان پشتیوانمانن ••! ئەگەر وا نەکەین ، ئەم چاودێریە گشتی یە نەبێت ، زوو کەسانی موفتەخۆرو هەڵمەتەکاسە لەناوماندا پەیدا دەبێت ، بە پەیدابوونیشیان ، مانای وایە هیچمان نەکردوە ، چ بەنیسبەت ( تەماعکاری )یەوە کە دوژمنی قەناعەتە ، چ بەنیسبەت قەناعەتیشەوە ، ئەو ( قەناعەتە )ی کە ( صفەتێکی گرنگی ئەهلی تەسەوفە ) ••!

بە ڕاستی فەرمایشەکانی لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ، شایانی بایەخ پێدانێکی تایبەتیە چونکە لەدەروونێکی ڕاست و ڕەوان و پاکەوە دەهاتە دەرەوە •• ئیتر بە داخەوە ، فەرمانی پێداویستی مامۆستایەتی ، لەم پیاوە چاکە لەم زاتە پاکە ـ پاك و خاوێنی حەقیقەت و ڕاستی ـ دووری خستمەوە •• دوای ئەم ووچانە لەخزمەت خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )دا ، بابگەڕێینەوە بۆ کتێبەکەی ( مامۆستا مصطفی عسکری ) ـ ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە •

دیارە دوای ئەم پێشەکیانەو کارامەییو لێهاتویی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) شتێکی سەیر نی‌یە کە مامۆستا ( مصطفى عسكرى ) لەکتێبەکەیدا بڵێت : [ « مامەڕەزا » گەیشتبوە ئەو باوەڕە ، کە ئەبێ کۆمەڵی ( هەقە )بە شێوەیەکی نوێ ڕێك بخرێتەوەو شێوەی خەباتی کۆمەڵایەتی بە بزوتنەوەکەیان بدرێتو لەچوارچێوەی تەسکی سۆفی‌گەری ببرێتە دەرەوە •• ] ـ تەواو ـ

گومانی تێدانی‌یە ، کە گواستنەوەی کۆمەڵەیەك ـ هەر کۆمەڵەیەك بێت ـ لەبارێکەوە بۆ بارێکی‌تر ، کارێکی ئەوەنە ئاسان نی‌یە ، چ بە نیسبەت کۆمەڵەکە خۆیەوە ••، چ بەنیسبەت ، ئەو کۆمەڵگە فراوانەی کەوا کۆمەڵەی باسکراو بەشێکە لێی ••• چونکە گواستنەوەکە ، وازهێنانێکی تێدایە لە هەندێ لەو بیرو باوەڕو کاروبارانە کە وا کەسانی سەربەکۆمەڵەکەو ئەندامانی دەقیان پێوەگرتوەو بوە بە پێناسێکی تایبەتیان، کەوا ڕاهاتنو پەروەردەو فێربون دەوریان تێدا بینیوە ، بەکورتی گواستنەوەکە گۆڕانێکە ••! ئەمە ئەگەر بنەتۆوێکی هاوبەش وەیا ناو کۆیەکی ( قاسم مشترك ) کۆمەڵایەتی ئەوتۆ نەبێت ، لەنێوان بزوتنەوەکەو هەنگاوی ئایندەو قۆناغی گواستنەوەکەیدا ••!

بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەم لایەنە نمونەیەك لەم جۆرە هەوڵو کۆششە دەگێڕمەوە کەوا دوای جەنگی بەکەمی جیهانی ڕووی داوە :

کە ئینگلیزەکان ( عیراق )یان داگیر کرد ، نێرراوێکی ( بعثة ) ئاینی مەسیحی ڕووی کردە دێیەکی خوارووی عیراق ، پاش هەوڵو تەقەلایەکی زۆر ، چەند کەسێکیان دەست کەوتو کۆکردەوە ، تا بیان‌کەن بە مەسیحیو بیان‌هێنێتە سەر ئاینی حەزرەتی ( عیسى ) ، دوای چەند مانگێك ، لەکۆبونەوەو ئامۆژگاریو دڵخۆشی دانەوەو ( لوتفو

مەرحەمەت ) ! ئنجا دوا قۆناغی بوونی ئەو کەسانە مەسیحی ( تعمید ) هاتە پشەوە بۆ ئەم مەبەسە سەرۆكقەشە وتاری کۆتاییو دوا ( قداس ) پێشکەش دەکات •• تیایدا باسی موعجیزەکانی حەزرەتی ( عیسی ) دەکات ! ئەوانیش لەکردەوەکانی حەزرەتی ( عیسی ) سەلامی خوای لێبێت ، سەرسام دەبن •• هەمو بە یەك دەنگ ، بەجارێك سەلاوات لەدیاری ( محمد )ی نازداریان ( د • خ ) دەدەنو دەڵێن : ( اللهم صلي علی سیدنا محمد وعلی آل سیدنا محمد •• ) ئیتر دوای ئەم ئەنجامە دڵتەزێنەو ئەم نامرادیە ، دێن هەمویان بەشێوەیەکی ناشیرینو پشتەملەو باڵەپەستۆ دەر دەکەن ••!

بەلام لە بزوتنەوەی ( هەقە )دا ئەو بنەتۆوە کۆمەلایەتیەی کە بریتیبو : لەیەکسانیو تەباییو هاوبەشێتی ، ئەمانە ناوکۆییەك بون ، کەوا گواستنەوەکەیان ئاسان کردبو •• هەروەها چالاکیو لێهاتوویی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )ش کاریگەر بو لەپەرەپێدانی ئەو بنەتۆوەو گەشەکردنیدا ، سەرەڕای ئەمەش ، وەکو پێشتر وترا کارەساتەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی یارمەت دەرێك بون ، بۆ کردوکۆشی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )و دەمەزەردکردنەوەو مشتومال کردنو بردنی مەسەلەکە بەبارێکیتردا ، بەباری کۆمەلایەتیداو زاڵکردنی ئەم لایەنە ، بەسەر لایەنی وشکەسۆفێتیدا ••!

بۆ ناسینو زانینی ئەم لایەنە کۆمەلایەتیە ، چەند برگەیەك لەنوسینەکانی کتێبەکەی مامۆستا ( مصطفی عسکری ) ، ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ، پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز دەکەین ، بەتایبەتی لەبارەی بەرنامەکەی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )وە بۆ ڕێکستنەوەی کۆمەڵەی ( هەقە ) ، کە بەڕاستی چالاکیو مرۆڤایەتی ئەم زاتەو ، پاكو

خاوێنی ڕێبازەکەیان بە جۆرێکی دیاردیو ئاشکرا خۆیی تێدا دەنوێنێت ـ ئەگەر بەندی یەکەمو دووەمی بەرنامەکەی لێ دەرکەین ، کە بریتیە لەچەند شتێکی گشتی کەلە هەموبزوتنەوەیەکدا ئاساییو ڕەمەکی هەیە ، بە جۆرێك بونیان وەیا سەرپێچیلێکردنیان لە ڕووی کۆمەلایەتیەوە ، وای لێهاتوە کەوا سەرنج ڕاناکێشێت ، چونکە لەکاروباری ناڕەوادا ـ نەك لەلایەن ( هەقە )کانەوە ـ بەلکو لەهەمو لایەکەوە ، ئەوەندە بۆ ئیشی نابەجێ لەکاردا بوە ، سواوە ، وەیا پێزی نەماوە ..! بەلام بەندی سێیەمیان کەباسی گیانی : هاوبەشیو دارایيو سامان دەکات ، ئەمەیان بایەخێکی تایبەتی هەیە ، چونکە بە ئەنجام گەیاندنێکی بەکردار بەکردار ( تطبيق عملى )بۆ فەرمایشەکانی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) کە لەپێشەوە باسمان کرد .

مامۆستا ( مصطفى عسكرى ) لە لاپەڕە ( ٣٩ )ی کتێبەکەیدا دەلێت : ( بەپێی ئەم پەیڕەوە هیچ کەسێکی ( هەقە ) خۆی لەئاستی کۆمەلەکەیدا بەخاوەن مالوسامانو زەوی نەزانیوەو هەر مالێکی بووبێت ، وا دانراوە هی کۆمەلەکەیە ، نەك تەنها هی ئەو ، بە واتەیەکیتر ئەومالە بە ئەمانەت دانراوە لەبەر دەستی خاوەنەکەیدا ، شێوەی ژیانی هاوبەشیو هەستی یەکێتیو بێ تەماعی ناو هەقەکان ، وای دەر ئەخست کە باوەڕیان بە جۆرە سۆشیالیزمێك بوبێ .. ) تەواو

لەبابەت سەربەستی ئافرەتەوە لە شەشەمین بەندی بەرنامەکەدا دەلێت :ـ ( هەقەکان باوەڕیان وابو کە جیاوازی لەنێوان پیاوو ئافرەتدا نییە .. هتد ) بێ چەندوچون ئەم باوەڕوڕایە شتێکی باشە ، شایانی بایەخ پێدانو لێدوانێکی زیاترە ...، بە تایبەتی لە کۆمەلگەیەکی دواکەوتوی وەکو کۆمەلگەی ئێمە ، کە بەگەلێك

شێوازی ئابڵوقەی سەربەستیو ئازادی ئافرەتی تێدا دراوە ، خۆ ئەگەر چەردەیەکیش سەربەستی هەبێت ، سەبارەت بەوەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە ( چەوساندنەوە ) ( الاستغلال ) هەیە ، ئابڵوقە دانەکەش سێیەرێکی سروشتی چەوساندنەوەکەیە ..! ئیتر دیمەنێکی سەیرنیە کە ببینین ئازادیو سەربەستییەکەی لەمەڕ ئافرەت ، لەناو ئەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا ، بە چەشنێکە ، کە ئادەمیزادێتیەکەی نوغرۆ کردوە ..! ئنجا لەکۆمەڵگەیەکدا ( نێرینە ) ، پیاو ! چەوساوە بێت .. ، بێگومان چەوساندنەوەی ئافرەت ، ( مێینە ) دووجار برزاوو خراپترە ..! هەروەها مامۆستا ( مصطفى عسكرى ) بە هەڵەدا نەچوە ، لەهەمان باسدا ـ لاپەڕە ( ٤٢ )ی کتێبەکەیدا ، بەو پەڕی ڕەوانبێژییەوە ( الصراحة ) پەچە لەڕووی سەروسەکوتی ئەو بیرو ڕاپەشانە ، لا دەبات کە ئازادیو سەربەستی ئافرەت بەشتێکی نەنگو ناشیرین دەداتە قەڵەم ! وە ئەم ئازادیو سەربەستیە ، بە جۆرێك لێك دەداتەوە کە لە گەڵ لەرزۆتای دەروونی نەخۆشو ڕەوشتو خووی ناسازی خاوەنەکەیدا بسازێت ...! کە دەڵێت : ( ... ئیتر بۆ ئەبێ ئەو سەربەستەیەی هەقە بۆ ئافرەتیان داناو وا بکرێ بەهەراو پرۆپاگەندەی لەدژ بکرێت ؟ بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە ، هەقە لەناو کۆمەڵێکی دوا کەوتودا ، دانیان بەسەربەستی ئافرەتدا نابو کە خەڵکی ئەوەیان بەئاسانی بۆ قوت نەئەچو .. ) ـ تەواو ـ واتە ئەو سەربەستیە ، لەگەڵ قۆناغی پێشکەوتویی کۆمەڵگە فراوانەکەی ، کە ( هەقە )کان تیایدا دەژیان ڕێك نەدەکەوتو دیارە ونەدەگونجا ، بۆیە تێی نەدەگەیشتن ، بە جۆرێکیتریان لێك دەدایەوە ..! یەعنی ( هەقە )کان لەم ڕووەوە گەلێك پێشکەوتوتربون لەکۆمەڵگە فراوانەکەی کەتیایدا بون ، وەبو پرۆپاغەندە دژیان ناحەزانی ڕێبازەکەیان ، چ لەدەرەوەیدا خواخوای شتێکی وابونو هەمیشە لەسەرڕێ

بون بۆیان ••!

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : باوەڕی ( هەقـــە )کـان بەنەبونـی جیـــاوازی لـــە نێوان پیـــاووئافرەتدا لەچی‌یەوە هاتوە ••!؟ بێگومـــاز لەو ( یەکسانی‌و تەبایی‌و هاو بەشێتی‌یـەوە ) هاتوە ، کـــە لەژیانـــی کۆمەڵایەتیاندا ، پەیڕەوی‌یان دەکرد بە تایبەتی لەبابەت : ئیش‌و فرمـان‌و بەرهەم هێنانەوە ( العمل والانتاج ) کەوا هەرەوەزکاری وڕەنجی بەگەلـە دەوری تێدا دەبینی ، وە لەدابەش‌کردنـی بـەروبومیشـدا ( التوزيـع ) یەکسانی‌و تەبایی‌و هاوبەشێتی باڵی بەسـەر کۆمەڵگەکەیاندا کێشابو • • لەم حاڵەتەدا ، تەنها لەم جۆرە کۆمەڵـگەیانەدا ، دەتوانین ، پڕ بەمانـای وشەکە بڵێین ئافرەت سەربەست‌و ئـازادە ••• چونکـە هەرەوەزکاری‌و ڕەنجی بەگەلە ، چالاکی‌و لێ هاتویی ( نێرومێ ) وەیـا ئافرەت‌و پیـــاو دەردەخات ، بایەخ‌و نرخ دەدات بە هەردوو لایان چون یەك •• سەبارەت بەوەی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵـگەیەدا ، جێ دەستیان دیارە•• جگە لەمەش لەم بارو ، دۆخەدا ئافرەت ئەرکی ئیش‌وکار لەسەرشانی پیاو سوك دەکات ، کە ئەمە دەبێتە مایەی ڕێزو بەرزبونـــەوەی جێ‌وشوێنـی ئافرەت‌و هەست‌کردنی بە ئادەمیزادێتی خۆی •• بۆیە زانایانی بایۆلۆجیـا باشی بۆچون کە وتویانە ، بە هۆی « ئیش‌و فرمانەوە » بوە ، کەوا مەیمون گۆڕاوەو بوە بە ئادەمیزاد ••!

وا دیارە ئەو هاوبەشێتی‌و یەکسانی‌یەی کە لەناو ( هەقە )کاندا هەیە، بگەڕێتەوە بۆ ئەو هاوبەشێتیە ( الاشتراكية ) سادەیەی ، کە زۆر لەپێشـ پەیدابونی ئیسلامـداو هاتنـی بۆ کوردوسـتان ، لەنـاو کۆمەڵـگەی کوردەواریدا ، پەیڕەو کراوەو حوکوم فەرما بـوە ، ئـــەم هاوبەشـێتی‌و یەکسانی‌یەی لەمەڕ ( هەقە )کانیش بەئەنجام گەیاندنێك ( تطبيق ) بوە بۆ

ئەو یەکسانیو تەباییەی کە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواری ئەوسادا هەبوە کەوا لەشێوەی نەریتوداب‌و دەستوردا ، ئێستایش شوێنەوارێکی هەرماوە، کەلە هاوبەشێتیو تێکڕا سودمەند بون لەبەکارهێنانی بەرهەمی داری کێوەکانی کوردوستاندا خۆی دەردەخات ، وەکو تێکڕا سودمەندبون لەبەرهەمی ( دارەبەنو هەرمێ کێویلەو دارمازووو گوێزی کێوی ٠٠! هتد ) ئەمە لەبارەی دابەش‌کردنو بەکارهێنانەوە (التوزیع والاستعمال)٠٠، بەڵام لەبارەی ئیشو کارەوە ( العمل ) وشەی ( هەرەوەز ) یەعنی ڕەنجی بەکۆمەڵو بەگەلە ٠٠، ئەم وشەیە چاکترین بەڵگەو نوێنەری ئەو هاوبەشێتیە دێرینەیە ، کە ( هەقە )کان ویستویانە ، بە ناوی ( تەسەوفە )وەو لەپەنا ئەمدا لە ناویاندا پەیڕەو بکرێت ٠٠، وەیا ( تەسەوفە )کەیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو نەریتە دێرینە مێژوویەی کە لە کوردوستاندا هەبوە ، وەتا ئەمڕۆش وشەی ( دەستیاو ) مافی ئەو ( هەرەوەز )ەی پاراستوە ٠٠!

بۆ نمونە : لەسەرەتای پەیدابوونو خۆداکوتانی ڕژێمی سەرمایەداریو دەسەڵاتی لە ئەوروپاداو زۆرانبازی لەگەڵ دەسەڵاتی (کەنیسە)دا ، گەلێك هەوڵو تەقەلا دراوە بۆ گونجاندنی پەیڕەوەکانی (کەنیسە) لەگەڵ ئەو بارە تازەیەو لەگەڵ سفەتە تایبەتیە کۆمەڵاتیەکانی ( Socoal - Characteristics ) میللەتەکاندا ، ئەو بارە تازەیەی کە لەکێشی (کەنیسە)دا نەبو ، کەوا سەرومڕو ڕوو بەڕوو بەرەنگاری ئەو گۆڕانکاریانە بوەستێتەوە کەلە کۆمەڵگەکانی ئەوروپادا بارەتازەکە هێنابویە کایەوە ٠٠! بۆیە گەلێك بزوتنەوەی فیکری - ئاینی ، لەم‌لاو ، لەلاو ، وڵاتەکانی ئەوروپادا بەرپا بو ، وەکو : ( پروتستانتی ، وکلفنی ٠٠ هتد ) ، تەنانەت میللەتی ئینگلیز گەرچی زوربەیان هەر بەناو (کاثۆلێك)ن هاتن کەنیسەکەی خۆیانیان ، بەناوی کەنیسەی ( ئەنگلیکان )یەوە جیا

کردەوە لەکەنیسە ( کاثۆلیك )یە سەرەکیەکەی ڕۆما ••، ئەم جیاکردنەوەیە ، جیاکردنەوەیەکە ، کە لەگەڵ جیاوازیە تایبەتیە کۆمەلایەتیەکانی ئنگلیزدا بگونجێت •••! ئیتر پەیدابونی مەزەبو پەیڕەوە جۆربەجۆرەکانیش،لە هەر ئاینێكدا بێت،دەربڕینو گومانجانێکی تێدایە ، لەگەڵ باری سفەتە تایبەتیە کۆمەلایەتیەکاندا کەلە دێر زەمانەوە ، لەمێژەوە ئەو میللەتەی پێ ڕاهاتوە ، ئاشکرایە هیچ کۆمەڵگەیەکی ئادەمیزادیش بێ مێژوو نی‌یە ••!

کورد دەڵێت : گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە •• ئەو بنچینە پتەوەی کەلەبارەی یەکسانیو تەبایی‌و هاوبەشێتیەوە لەناو کۆمەڵگەی ( هەقە )دا هەبو ، لەگەڵ لێهاتوییو کارامەیی خوالێخۆشبو (مامەڕەزا)دا بەجوت گوڕێکیان دایەوەبە بزوتنەوەکەیان ئەمە سەرەڕای کارەساتی‌تری کۆمەلایەتی‌و بگرە سیاسیش کەلە ناوچەکەدا ڕوویدا ، کەوا بون بە هێزێکی پاڵپێوەنەرو پشتیوان ، بۆ بەرەوپێش‌چونی کۆمەڵەکەیان لەبابەت یەکسانی‌و هاوبەشێتی‌یەوە ••! بەلام بەداخەوە تەمەنی کورتی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) سەکتەیەك بو بۆ بزوتنەوەی ( هەقە ) •

گەرچی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا ) پێشەوای ڕێبازێکی ئاینی و « تەسەوف » بو بەلام لەکاروباری پێشکەوتنخوازانەدا ، کە ئەو سەردەمە لەئارادا بو ، زۆر بە پەرۆشەوە ، بە پیری‌یەوە دەچو ، وە ئازایانە بەشداری دەکرد •

ئیستیعمارگەران ، بە تایبەتی ئیستیعماری ئەمەریکی لە هەردوو جەنگە جیهانیەکەدا سالانی ( ١٩١٤ تا ١٩١٨ ) و ( ١٩٣٩ تا ١٩٥٤ ) لەئەنجامی هەردوو جەنگەکەیان خواردبو تەواو دەوڵەمەندو مڕبوبون ! چونکە لە هەردوو جەنگەکەو هەردوو تاوانەکەدا کەسابەت‌و بازرگانیان

بەکوێرەوەری مەینەتی خەڵکیەوە دەکرد ! بۆ ئەوەی لەمەڵبەندو ، وڵاتیاندا فیشەکێك پتەقێت ، وەیا گرمەی بۆمبایەك ببیستن لەهەردوو جەنگەکەدا ، جاف واتەنی : ( شەقەی قەڵماسنگیان نە بیستبو )! ـ قەڵماسنگ یەعنی قۆچەقانی ـ •• سەرەڕای ئەمەش سەبارەت بە دۆزینەوەی وزەی ئەتۆم ( الطاقة الذرية )و بەکارهێنانی وەکو بۆمبایەكو هێزێکی وێرانکار بەرامبەر بەشاری ( هیرۆشیماو ناگازاکی )لە ژاپۆن •• هەر لەوساوە هەڵبژاردنو پەسندکردنی ئەم ڕێبازە ـ ڕێبازی تەمێ‌وهەڕەشە کردن بە ئەتۆم ••! کردنی بەبەرنامەو شێوازێك لەلایەن کۆڕوکۆمەڵانی ڕەسمی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە ، ئەو کۆڕوکۆ مەڵانەی کە لە ئەنجامی هەردووجەنگەکەدا دەمیان چەور بوبو •! ئەم ئەنجامانە زیاتر ئەو کۆڕوکۆمەڵانەی شێت‌گیر کرد ، گڕیان بەردایە گیانی دڕندەیی‌و چاوچنۆکی ئیستیعمارو دەست‌وپێوەندەکانی ، دانیان لەجەنگێکی‌تری جیهانی تیژکرد ••، بە وزەی ئەتۆمەوە کەوتنە هەڕەشەو گوڕەشە لەژیانی بەرەی ئادەمیزادو چارە نووس‌و پاشەڕۆژی ••!!

بەڵام بەرەی پێشکەوتنخوازان لێیان ڕاپەڕین لەشاری ( استکهولم)دا لەسوید ماف پەروەرانی دیموکراتی جیهانی ، مانیفیستی ئاشتی‌و پاراستنی ئاشتی جیهانیان ئیمزاو بڵاوکردەوە ••، کۆمەڵانی خەڵك لەڕۆشنبیران‌و هونەرمەندان‌و زانایان‌و پیاوماقوڵان لە ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقاو ، ئەمەریکاو ئاوسترالیادا ، بەگەرمی پێشوازی ئەو بەیاننامەیەی ئاشتیەیان کردو بناغەی ئاشتی نێو دەوڵەتانیان داڕشت ••• هتد خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )ش ، یەکێك‌بو لەوانەی کە بەوپەری سۆزەوە بەپیر ئەم مانیفیست‌و بەیاننامەیەوە ، چوە ، وە بەوپەری دڵسۆزیشەوە ، لەم ڕێبازەدا ( ڕێبازی ئاشتی‌و پاراستنی ئاشتی جیهانی ) وەکو شەخسیەتێکی کۆمەڵایەتی ئاغرودوورئەندیش بەشداربوەو تێکۆشاوە •• تەنانەت بۆ

ئەم مەبەسە لەتاقمەکەی خۆیی بۆتەرخان کردبو ، وەکو خوالێخۆشبو ( مەلا صابری سۆفی محمد ) ـ لاپەڕە (٤٩) ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە ـ مصطفی عسکری .

بۆ ئەوەی بەچاکی لەڕێبازی ( هەقە )و شەخسیەتی خوالێخۆشبو ( مارەزا ) تێبگەین با لەئاستی ئەم دوو ڕووداوەدا ، کە لەشێوازدا لەیەك دەچوو لەنیەتونیازدا لەیەك جیا دەبنەوە ... تۆزێك بوەستین ، وەبە چاوێـکی ڕەخنەگری و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن بە وردی سەیرێکیان بکەین .. ئەوسا ڕەوشتی ڕاستەقینـەی پسپ لەمەردایەتـی و مرۆڤایەتـی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )ی پێشەوای( هەقە )کانمان بۆ دەردەکەوێت .. تا لە شوێنی شایستەی خۆیدا دای نێین و غەدری لێ نەکەین .. هتد

١ ـ لەدێی ( س .. )دا جاڕی ( اعلان ) تەسویە دەدرێت ... ئاغای دێ بە تەمای دێبەروبەراوی فەلاحێـك دەبێت کەلەســـەر خـۆیی تەسویەو تاپۆ کات ..! کابرای خاوەن دێبەروبەراو ملـی بۆ نـادات .. چونکە لەباوكو باپیریەوە ئەو زەویەی بە دەستەوە بوەو بەکاری هێناوە ، پێ ی ئەغز بوە بیدات بە دەستەوە ..! ئنجا ئاغاپیلانی شایەتو شایەتکاری دێنێتە پێشەوە بۆ ئەوەی بەئاواتـــی خـۆی بگـات ...! دوای چەنـد کوبونەوەیەکی نەهێنی لە ( دیوەخان )دا ..! دوو کەس پەیـدا دەکـات کەوا بە ( پارەیەك ) ! شایەتی بۆ بدەن و دێبەرو ، بەراوەکـەی بۆ سـاغ بکەنەوە ... بەڵام بۆ ڕۆژی تەسویەو سوێندخواردن لەسەر (تەسەڕوف)و خاوەندێتی دێبەروبەراوەکە کە گوایا هی ئاغایە ، چی بکـــەن ..!؟ دوای وتوویژو چەند دانیشتنێـکی نەهێنی تر ، دەگەنە ئەوەی ، کەپێڵاوەکانـی ئەم دووشایەتە ، هەندێ لەگڵی ، زەویەکی ئاغای تێ بکەن ...، ڕۆژی تەسویە بەو پێڵاوانەوە کە لە گڵی زەویەکەی ئاغای تێدایە ، بچنە ناو زەوی

ناو براوەوە ، سوێند بخۆن کە : ( ئەو خاکەی لەژێر پێیاندایە ، هــی ئاغایەو مافی کەسی پێوە نی‌یــەو ئاغــا بەکــاری هێنــاوەو تەسەڕوفــی کردوە ..! ) بەم چەشنە زەوی ناوبراو بۆ ئاغا تەســویەکراو ، ســاغ بوەوەو هەر بەم سوێندە ( توریە )یە ، ئەم دوو شایەتە ساختەچیە لەتەنگ و چەڵەمەیەکی ویژدان و ( اخلاق ) دەربازبون ..! وە بۆ ساڵی ئایندەش تەدارەکیان بۆ وەرزی ( حەج ) ڕێــکخست ، کە پێش ئەم سوێندە خێریان پێ دەشیاو ماری ڕەش یەقی بۆ دەکردنەوە ..!!

٢ ــ لەدێی ( گەڵنێری )دا جارێ تەسویە دەدرێت ، ئاغاکانی ئــەم ناوچەیە ، دەیانویست زەوی و زاری ئەم دێیە لەسەر خۆیان تەسویەو تاپۆ بکەن ، فەلاحەکان و خاوەنی ئەسڵی زەویەکانی لێ بەری و مافندی کەن ــ لاپەڕە (٣٧) ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ــ مصطفی عسکری ــ .. فەلاحەکانی ئەم دێیە تین یان بۆ دێت ..، هانا بۆ خوالێ خۆشبو (مامەڕەزا) دێنن ، کە فریایان کەوێت ! لەکۆششی ڕەشی ئەو ستەمکارانە ڕزگاریان کات ..، خوالێ خۆشبو ( مامەڕەزا ) دێت دێی ( گەڵنێری ) لەسەر خۆی تەسەویە دەکات ، ئەو ئاغایانەش بەربەرەکانی ( مامــەڕەزا ) ناکــــەن .! سەبارەت :

أ ــ بەجێ و شوێنی خوالێ خۆشبو ( مامەڕەزا )لــەو ناوچەیــەدا . ب ــ تا دەمی شیرین کەن و فێری دەست درێژی بکەن . ح ــ لەبەرچاوی فەلاحەکان و ناوچەیە ڕەشی کەن و لە کەلەپووری کۆمەڵایەتی ئەم زاتە ، لای ئەوان کەم کەنەوە . ع ــ دواجارو سەرئەنجام بێت بە یەکێك لەوان و بێتە ڕیزیانەوە ..!

بەڵام خوالێ خۆشبو ( مامەڕەزا ) دوای تەکاندنەوەی ئەو ئاغایانــە لەخاوەندایەتی زەوی و زاری دێی ( گەڵنێری ) .. ئنجــا دێت زەوی و



جێنشینی مامەرەزا ـ شێخ کاکە حەمەی کوڕی

زاری ئەمدێیەو کێڵگەکانی هەموی بە ناوی خاوەنەکانیەوە ، لەتەسویەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی دەداتەوە بەخاوەنەکانی ..! لەڕاستیدا ئەم کردەوەیە ، لەهەمو کەسێك ناوەشێتەوە ، کەئەگەر خاوەنی هەست‌وبیرو باوەڕێکی پتەوی پێشکەوتنخوازی کۆمەڵایەتی نەبێت ..!

ئیتر بۆچی دەبێت ( هەقە )و ( هەقە )یەتی لەناو کۆمەڵگە فراوانەکەدا ، کە تیایدا دەژین بەچاوێکی سەیر تەماشا بکرێن ..!؟ بزوتنەوەیەك ، کە بەش‌بەحاڵی خۆیان‌و ئەندامانیان ، بە هۆی یەکسانی‌و هاوبەشێتیەکەیانەوە ، توانیێتی پرزەی دزی‌و درۆزنی‌و خراپەو بەدکاری ببڕێت‌و ڕێ ڕەوشت نزمی ببڕێتەوە ..! ومانایەکی تازە بدات بەڕێبازی ( تەسەوفە )کەیان ..!؟ وەیا بۆچی دەبێت ڕوشنبیرانمان ـ هەرچۆنێك بێت پلەی ڕۆشنبیرێتیان ـ واتەی داگیرکەری بێگانەی گێرەشێوێن بسەلمێنن‌و بی‌ڵێنەوە ، بێ ئەوەی کەوا تۆزێك خۆیان ماندوو کەن‌و بۆ بەڵگەیەکی دیاردی‌و ئاشکرا بگەڕێن ، تا بیکەن بەپاڵپشت بۆ دەرخستن‌و ڕوونکردنەوەی حەقیقەتێك وەیا بۆ بەپەرچدانەوەی بوختان‌و تۆمەتێك کەلە بنەڕەتداو لەپەناوە ، لەکۆڕو مەڵبەندە ئاشکراو نەهێنیەکانی ، داگیرکەرو ( جەردەی نەوتە )وە ! وبەفەرمانی ئەوان بەرامبەر بە (هەقە) هاونیشتمانیەکانیان دەهاتە دەرەوەو جێ پەنجەوموری ئەوانی پێوەیە ..!؟ بەکورتی لەهەڵبەست‌و ئاوازی ئەوانە ..!

هەرچەندە بزوتنەوەی ( هەقە ) لەسەرچاوە فەلسەفیەکەیەوە ، جیاوازە لەم ڕوو داوەی ، کەوا کۆتایی یاسەکەیانی پێ دێنم ، بەڵام لەسەر ئەنجامدا ، لەکاتێکدا کە ئادەمیزاد بەرەوڕووی ئازارو ئەشکنجو تەنگانە دەبێتەوە . واتە لەکاتێکدا بەتاقی‌کردنەوەدا دەڕوات .. لە بوارەدا مەردایەتی‌و ئازایەتی دەردەکەوێت ، کەوا لە شێوەی بەرگری‌و قاراستتی

ئەو بایەخە مرۆڤایەتیانەدا خۆی دەنوێنێت‌و شەوق دەداتەوە ، ئەو نرخ‌و بایەخانە کە ئەو ئادەمیزادە خۆیی بۆ تەرخان‌کردبو ، وەبوبو ، بەبەشێك لەژیانی ••! وەیا پێ‌ی کۆش کراوە •

هەروەها بەنیسبەت دوژمنانی مرۆڤایەتی‌و ئادەمیزادێتیشەوە ، بـەلای ئەوانەوە کەپیشەیان بوختان‌و جنێو فروشتنە بە : نەقـــد ( کاشـن )یـان بەقەرزوقیست ••!! ئەرچی لە شێوازیاندا ، جیاوازیەکیشیان هەبێت •• ئەمانیش مەبەسی خۆیانیان پێ ناشاردرێتەوەو دەی‌در کێنن : کەوا ئامانجیان تاساندن‌و تێك‌شکان‌و پێ‌شێل‌کردنی ئەو مرۆڤایەتیەو هـــەمو بایەخێـکی ئادەمیزادێتیە ••! ئیتر لێرە ناحەزی ( هەقە )کـان ، لـــەوێ دادگـاو داواکاری گشتی ( المدعي العام ) ئیتالیا •

( ئەنریکۆمالاتیستا )ناو بەتۆمەت‌و تاوانـی ئاشـوب‌و ئاژاوەنانـەوەو تێـکدانی ئاسایش ••• هتد دەدرێت بەدادگایەکی ئیتالیا : داواکاری گشتی، لەدادگا دەخوازێت کە ئەم کابرایە بەتوندی سزا بدرێت ، چونکە گەلێك کاری لەڕەوشت‌و خووی کرێـکاران کردوە ، بەجۆرێـك کـە دزی‌و خراپەو تاوانیان لەناودا نەمـاوە لەپاشـا دەڵێت : ئەگەر خراپەو تاوان ، نەمێنێت ، ئێمەمانان‌و دادگا ئیشمان چی‌یە ••!؟

ئیتر ئەگەر بزوتنەوەی ( هەقە ) ، تەنانەت بەش‌بەحاڵی خوێشیان بەیەکسانی‌و تەبایی‌و هاوبەشێتیەکـەیان برەووبایەخێـکیان داوە بـــە ( چاکە ) ، بەم پێ‌یە دەبێت ناحەزانیان ، بۆ مەرگی (خراپەو خراپەکاری)و بۆچارەنوسی ( دادۆشین‌و چـەوسانەوە و موفتەخۆری‌و قۆڵبڕین •• ) غەم بەژارە دایان گرێت ••!هەروەها دەبێ بۆ پاشەڕۆژی تاریك‌و نوتەکی ( هەژاری‌و ئاتاجی‌و ڕەجاڵی‌و بەندایەتی •• ) قوڕپێون‌و بێکەن بە گابۆڕ ! ئەگینە بۆ بەردەوام‌بۆن‌و مانەوەی ئەم کوێرەوەری‌و مەینەتیانە نەبێت ئـەم

ناحەزانە ئەم جانەوەرانە ئیشیان چی یە ..!؟

خۆ ئەگەر وەکو کورد دەڵێت : مەڕ بەپێی خـــۆی و بزن بەپێی خۆی لەبازاڕدا هەڵواسرێت ! هەمو کەسێك ، هەمو بەرەیەك بەشێواز ( اسلوب )و کردەوەی خۆیەوە دەچێتە ئەوبازاڕەوەو دەچێتە مێژووەوە ..! ( هەقـە ) کانیش بەیەکسانی و تەبایی و هاوبەشێتیـە کەیـان و ئەنجامـی ئەمانـــە بەسەرکردەوەو ڕەوشت و شێوازیانەوە ، چونەتە مێژووەوەو .. هەروەها ناحەزانیان و ئەوانەی کە مستر ( سیسل . جون . ئەدمۆندز )و میرو گزیرو جەردەکانی ( نەوت )و کۆڵ هەڵـگرانیان ..!! تفیان کردۆتە دەمیانەوە ، ئامانیش بێ بەش نابن ، دەچنە مێژووەوە ..! بەڵام مێژوویـــەك ، کــە مێژووی بەرەی ئادەمیزاد بێزی لێ دەکاتەوەو نەفرەتی لێ دەکات ..!!

تێبینی :

١ ـ لە ڕووی یارمەتیدانەوە زۆرسوپاسی ـ قوتابـی پەیمانگـەی تێکنۆلۆجیا شێخ‌دانای کوڕی حاجی شێخ کاکە حمەی کوڕی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە دەکەم •

٢ ـ تکایە ئەوی وێنەی خوالێخۆشبو ( مامەڕەزا )ی لا دەست ئەکەوێت ـ بەهیمەت یان بەقیمەت نوسخەیەکمان بۆ بنێرێت پێشەکی سوپاسی ئەکەین ••

## سەرچاوەکانی باسەکە :


١ ـ معجم مصطلحات العلوم الاجتماعية ـ الدكتور احمد زكي بدوي

٢ ـ ( کرد ، ترك ، وعرب ) دانەری ( سی • جی • ئەدموندز ) تعريب المحامي : جرجيس فتح‌الله ـ من منشورات ( التآخي ) •

٣ ـ ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ـ مصطفی عسکری

٤ ـ ڕوژنامەی ( العراق ) ژمارە ( ٢٣٣٤ ) ڕۆژی ٥/١٠/٩٨٣

٥ ـ مجلة ( کاروان ) ژمارە ( ١٥ ) ـ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣

٦ ـ ئافرەتی کورد ـ دانەری مسز ( هێنی هارولْدهانسن ) ـ تەرجومەی ماموٚستا عزیز گەردی •

٧ ـ یادی‌مەردان ـ بەرگی دووەم ـ دانەری ماموٚستا ( ملا عبدالکریمی مدرس )

٨ ـ احياء علوم الدين ـ للامام الغزالي

٩ ـ کۆمەڵە ڕوژنامەی ـ چەمچەماڵ ماموٚستا شاکر فتاح

١٠ـ لمحات من تاريخ العالم ( جواهر لال نهروو )

